# پێشەکی وەرگێڕ

**بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ**

**الحمدلله والصلاة والسلام على رسول الله وعلى آله وصحبه ومن والاه أما بعد :**

سوپاس بۆ الله تعالى کە یارمەتیدایین بۆ وەرگێڕانی ئەم کتێبە و ڕێکخستنی ، ئەو کتێبەی ئێستا لەبەردەستتان دایە بریتییە لە ڕیسالە بەسوودەکەی ئیمام إسماعيل الصابوني رحمه الله بەناوی ( عقيدة السلف أصحاب الحديث ) یاخود (الرسالة في أعتقاد أهل السنة والجماعة وأصحاب الحديث والأئمة) ئیمام رحمه الله لێرەدا سەدە دوای سەدە تاوەکو سەردەمی خۆی بیروباوەڕی شوێنکەوتوانی سوننەتی نەقڵ کردووە ، ناوەڕۆکی ئەو ڕیسالەیەش هەمان ناوەڕۆك و بیروباوەڕی سەلەفی ئوممەتە لەو پێشەوایانەی پێش خۆی کە باسیان کردووە لە بیروباوەڕەکەیاندا وەك پێشەوا احمد لە ( إصول السنة) دا وە ( أصول السنة ) ی پێشەوا حەمیدی رحمه الله بەهەمان شێوە حەربی کرمانی لە عقیدەکەیدا وە عبدالله ی کوڕی ئیمام احمد لە کتێبی ( السنة ) دا وە پێشەوا لالکائی رحمه الله لە ( شرح أعتقاد أهل السنة والجماعة ) دا وە پێشەوا بەربەهاری لە ( شرح السنة) دا وە ئەوانەشی لەدوای ئیمام لە زانایانی ئەهلی سوننەت و جەماعەت وەك ئیمام ئیبنو قدامەی حنبلی لە ( لمعة الآعتقاد ) دا وە ئیبن تیمیە لە (العقيدة الواسطية ) دا ، ئەوانە و کۆمەلێکی تر لە ڕیسالە و کتێبی ئەهلی سوننەت و جەماعەت کە تیایدا میزانێکیان دارشتووە بەبەڵگەی قورئان و سوننەت و تێگەشتنی هاوەڵان و پێشینانی چاکی ئەو ئوممەتە لەسەر جیاوازی نێوان ئەهلی سوننەت و جامەعات و گروپە گومڕاکانی تر سەبارەت بە أسماء و صفات لەجێگیرکردنی سیفاتەکانی الله تعالى بەبێ چۆنیەتی و چواندن و نموونە بۆ هێنانەوە و هاوشێوە بۆ دانان و تەئویل کردن و کۆمەڵێکی تری باسی عقیدەیی گرنگ کە بریتیە لە بنچینە و بنەماکانی پێشەوا و شوێنکەوتوانی پێشینانی ئەم

ئومـمـەتە ، وە ئـێمەش پشـتیوان بە اللە تعـالی توانیمـان ئەو ڕیسـالە بەسـوودەی ئیمام وەربگێڕینەوە بۆ زمانی کوردی کە تەنها بریتیە لە دەقی مەتنی نامەکەی ئیمـام بەبـێ ڕوونکـردنەوە ، وە توانیمـان بە پێـی توانـا ڕێکخسـتنێکی تەواو و بەوشـێوەی کە پێمـان بـاش بـووە بـۆ هەر بەشـێك لە دەقـی نـامەکەی ئیمـــام دابڕێـژین وە توانیمـان بەپێـی توانـا سـەرچاوەی فەرمـوودە و ڕوونکـردنەوەی دروسـتیەتی و لاوازی فەرموودوکـان و ئامـاژەدان بەسـەرچاوەی هەنـدێك ئاثـاری پێشەوایانی پێشین کە سەرچاوەکانمان لە ڕوونکردنەوەکەی عبدالعزیز الراجحی وەرگرتووە لە ڕوونکردنەوەکەی بۆ ئەو ڕیسالەیە ئەو سەرچاوانەشی کە عبدالعزیز الراجحی ئاماژەی پێنەداوە توانیومانە بەپێی ێیویست ئاماژە بەسەرچاوەکانیان بـدەین ، وە ئیمـام رحـمە اللە هۆکـاری نوسـینی ڕیسـالەکەی ڕوونکـردۆتەوە لە پێشەکیەکەیدا بۆ ڕیسالەکە ئەوە نەبێت کەوا چەند تێبینیەك هەیە لەسـەر ئیمام وەك گوتـوویەتی ( بەڕێگـاوەم بـۆ مـاڵی خـودا و سـەردانی کردنـی گـۆڕی پێغەمبەرەکەی ( صلی اللە علیە وسلم )) تێبینی هەیە لەسەر ئەو وتەیەی ئیمام کە عبدالعزیز ڕاجحیش ئاماژەی پێداوە کە وا پێویست و چاکتربوو ئیمام بلێت (بەڕێگاوەم بۆ ماڵی خودا و سەردانی کردنی مزگەوتی پێغەمبەرەکەی ( صلی اللە علیە وسلم )) بەهـۆی ئەوەی کە دروسـت نیـیە بەتـایبەتی بچیـت بـۆ سـەر گـۆڕ پێغەمبەری اللە ( صلی اللە علیە وسلم ) ڕێگری لێکردووە ، بەڵام ڕوونە و ئاشکرایە کە ئیمام بیروباوەڕی سەلەفیە و دوورە لە بیدعە و هەوا و ئارەزوو وەك چۆن لەو نامەیەیدا ڕوونی کردۆتەوە .

داواکـارم لە اللە تعـالی لێمـی قبـوڵ کـات و ئەو کـارەم بە ئیخلاسـی بـۆ ڕووی اللە تعـالی کردبێـت و سـود بگەیێنێـت بە خوشـك و برایـانی موسـڵمانم کە زمـانێکی عەرەبی تەواویان نییە و نـاتوانن شـارەزای بیروبـاوەڕی سـەلەف ببن ئەو کتێبەش پشـــتیوان بە اللە یـــارمەتی دەردەبێـــت بـــۆ تیگەشـــتن لەمەنهەجـــی ســـەلەف و

دەستگرتن بەسـوننەتی پێغەمـبەرەوە ( صـلى الله عليـه وسـلم )و دووربـوون لە بيدعە و بيدعەچيان و قسەكردن لەسەر دين بەهەوا و ئارەزوو .

**وەرگێڕ**

**سيف الله السني** .

## شێخی ئیسلام ئەبو عثمان الصابونی دەفەرمووێت

**الحمد لله رب العالمين ، والعاقبة للمتقين ، وصلى الله وسلم على محمد وآله أجمعين ، أما بعد :**

کاتێك کە گەیشتم بە مەودایەك لەنێوان طبرستان و شاری جیلان وە بەڕێگاوەم بۆ ماڵی خودا و سەردانی کردنی گۆڕی پێغەمبەرەکەی محمد سەڵاوات و سەلامی الله لەسەر خۆی و بنەماڵە و هاوەڵە بەڕێزەکانی ، برایانی دینیم داوایان لێکردم کە چەند بەشێك لە بنچینەکانی دینیان بۆ ئامادە بکەم کە ئەوانەی پێشوو دەستیان پێوەگرتبوو لە گەورەیانی دین و زانایانی موسڵمانان و پێشینانی چاك ، وە لەهەموو کاتێکدا ڕێنمونی و بانگەوازی خەڵکیان بۆ کردووە ، وە ڕێگریان کردووە لە دژەکانی و نەرێیەکانی ، کۆمەڵەی ئیمانداران و ڕاستگۆیان و تەقواداران ، وە دۆستایەتی و دوژمنایەتیان لەپێناو شوێنکەوتنیدا کردووە ، وە ئەوەی جگە لەو بیروباوەڕەی هەبووبێت بە بیدعەچیان داناوە و کافریان کردووە ، وە ئەو بەرەکەت و خێرەیان بەدەست هێناوە بۆ خۆیان و بۆ ئەوانەش کە بانگەوازیان بۆ کردووە ، وە گەڕێندراونەتەوە بۆ ئەوەی پێشکەشیان کرد لە پاداشتی بیروباوەڕەکەیان و دەستگرتنیان پێیەوە و ڕێنموونی کردنی بەندەکان بۆی و بەردەوامی ئەوانیش لەسەری ، بۆیە ئیستیخارەم کرد بە الله تعالى و لەو باسەدا هەڵدەستم بە سەلماندنی بەپێی توانا و بەشێوەیەکی پوخت ، بە تکای ئەوەی کە کەسانی خاوەن ژیر و بیر و دووربین سودی لێوەرگرن ، وە الله تعالى خۆی زانایە بە گومانەکان وە بەخشەرە بەسەرمانەوە بە ڕێنموونی و بەردەوامی لەسەر ڕێگای ڕاست و هەق بە منەت و فەزڵی خۆی .

پشتیوان بە الله گوتم :

## ( سیفاتی هاوەڵانی حدیث )

هـاوەڵانی حـدیث الله زینـدوانیان بپارێزێـت و ڕەحـم بە مردووانیـان بکـات ، شایەدی تەنهایی بۆ الله تعالی و پەیام و پێغەمبەرایەتی بۆ پێغەمبەرەکەی ( صلی الله علیه وسلم ) دەدەن .

## ( ناسینی سیفاتەکانی الله بە نیگا و دابەزێنراوەکانی )

خودای خۆیان دەناسن بە سیفاتەکانی کە دەربیڕیوە و بەنیگا و دابەزێنراوەکانی ، یاخود پێغەمبەرەکەی ( صلی الله علیه وسلم ) شایەدی بۆ دابێت لەو هەواڵانەی کە بەدروســتی لەبــارەیەوە هــاتوون و کەســانی دادپەروەر و متمــانەپێکراو گواستویانەتەوە ، وە هەمـوو ئەو شـتانە جێگیـر دەکەن کە الله لە کتێبەکەیـدا و لەسەر زوبانی پێغەمبەرەکەی ( صلی الله علیه وسلم ) بۆ خۆی جێگیری کردووە ، وە بڕوایـان بە لێکچوانـدنی سـیفاتەکانی بە سـیفاتی دروسـتکراوەکان نیـیە ، وە دەڵێن الله بەدەستـەکانی خۆی ئادەمی دروست کـردووە ، وەك چۆن الله تعالی بەڵگەی لەبـارەوە داوە لە وتەکەیـدا : ( قَـالَ يَـا إِبْلِيسُ مَـا مَنَعَـكَ أَن تَسْـجُدَ لِمَـا خَلَقْـتُ بِيَـدَيَّ )[1] ، وە وتەکـان لەڕێـرەوەی ماناکانیـان لانـادەن بە لێکـدانەوەی هەردوو دەسـت بە ڕۆزی و نیعمەتەکـانی ، تەحریفـی مـوعتەزیلە و جەهمیەکـان ، الله بە هیلاکیــان ببــات ، وە چــۆنیەتی بــۆ ســیفاتەکان بڕیــار نــادەن یــاخود لێکچوانــدنی بەدەســتی دروســتکراوەکان ، وەك لێکچوانــدنی لێکچــوونەران (المشـبهة) الله ڕوو ڕەشـیان بکـات ، وە الله تعـالی پەنـای ئەهلـی سـوننەی دا لە تحریـف کـردن و لێکچوانـدن و چـۆنیەتی ، وە زانـین و تێگەشـتنی پـێ بەخشـین ، تـاوەکو ڕێگــای تەوحیـد و ڕێگــای بەتـاك ڕاگرتنـی الله یـان گـرتەبەر ، وە وازیـان هێنـا لە قسـەکردن لەسـەر پەکخسـتن و لێکچوانـدنی سـیفاتەکان ، وە شـوێن

(1) سورة ص : 75 .

فەرمایشتی الله تعالی کەوتن وەك فەرموویەتی : ( لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ ۖ وَهُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ )[2] .

## ( جێگیرکردنی هەموو ئەو سیفاتانەی هاتووە لە قورئان و سوننەت بەبێ لێکچواندن و نموونە بۆهێنانەوە و بەبێ چۆنیەتی و گۆڕینی )

بەهەمان شێوە لەسەر هەموو سیفاتەکان کە باسیان لە قورئاندا هاتووە وە لەسوننەتیشدا بەڕاستی هاتووە ، لە سیفەتی گوێ و بینین و چاو و ڕوو و زانست و هێز و توانا و عیزەت و گەورەیی و ویستن و ویست لێبوون و قسە و وتە و ڕازیبوون و تورەیی و ژیان و خۆشەویستی و ڕقلێبونەوە و دڵخۆشی و پێکەنین و هاوشێوەیان ، بەبێ چواندنی ئەو سیفاتانە بەهیچ شتێك لە سیفاتی دروستکراوەکان ، بەڵکو تا کۆتایی ئەوە ڕادەوەستن کە الله تعالی و پێغەمبەرەکەی ( صلی الله علیه وسلم ) فەرموویانە بەبێ زیادکردن و دانەپاڵی شتێك بۆیان و بەبێ چۆنیەتی و بەبێ لێکچواندن ، وە بەبێ گۆڕینی و لادانی و لابردنی وە بەبێ لابردنی لەفزی هەواڵەکە لەوەی کە عەرەب دەیزانن و گۆڕینی بەلێکدانەوەیەکی هەڵە و خراپ ، وە لەسەر ڕوکەشی خۆی بەڕێی دەکەن وە زانستەکەی دەگەڕێننەوە بۆ الله تعالی وە داندەنێن بەوەی کە لێکدانەوەکەی جگە لە الله کەس نایزانێت ، وەك چۆن الله باسی ڕۆچووان لەزانستی کردووە لە فەرمایشتی الله تعالی : ( وَالرَّاسِخُونَ فِي الْعِلْمِ يَقُولُونَ آمَنَّا بِهِ كُلٌّ مِّنْ عِندِ رَبِّنَا ۗ وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّا أُولُو الْأَلْبَابِ )[3] ، وە ئایەتەکانی قورئان و هەواڵە صحیح و ڕووناکەکانی پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) زۆرە کە ئەو سیفاتانە و جگە لەوانەشیان دەربڕیوە .

(2) سورة الشورى : 11 .

(3) سورة آل عمران : 7 .

## ( بیروباوەڕی سەلەف دەربارەی قورئان و سیفەتی قسەکردن بۆ الله تعالی )

وە هـاوەڵانی حەدیـث شـایەدی دەدەن و بڕوایـان وایە کەوا قـورئان قسـەی الله تعالی یە وە کتێب و نیگا و دابەزێنراویەتی ، دروستکراو نییە ، وە ئەوەشی بڵێت دروستکراوە یاخود بڕوای وابێت ئەو کەسەیان لا کافرە ، وە قورئان قسە و نیگای الله یە ، ئەوەیە کە جوبریل دایبەزاندووە بەسەر محمد ( صلی الله علیه وسلم ) : ( قُرْآنًا عَرَبِيًّا لِّقَوْمٍ يَعْلَمُونَ * بَشِيرًا وَنَذِيرًا )[4] وەك الله تعالی فەرموویەتی : ( وَإِنَّهُ لَتَنزِيلُ رَبِّ الْعَالَمِينَ * نَزَلَ بِهِ الرُّوحُ الْأَمِينُ * عَلَىٰ قَلْبِكَ لِتَكُونَ مِنَ الْمُنذِرِينَ * بِلِسَانٍ عَرَبِيٍّ مُّبِينٍ )[5] ئەوەیە کەوا پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) گەیاندوویەتی بە ئومەتەکەی ، وەك الله فەرمانی کردووە پێی بەگەیاندنی لە وتەکەیدا : ( يَا أَيُّهَا الرَّسُولُ بَلِّغْ مَا أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ )[6] جا ئەوەی کە بەفەرمانی الله تعالی پێیانی گەیاند قسەی الله تعالی یە ، وە لەوبارەیەشەوە پێغەمبەری الله ( صلی الله علیه وسلم ) فەرموویەتی : ( ڕێگریم لێدەکەن لەوەی قسەی خواکەم بگەیێنم )[7] وە ئەوەیە کە لە سینگەکاندا هەڵگیراوە و زووبانەکان دەیبێژنەوە ، وە لە موصحەفەکاندا دەنوسرێنەوە ، هەرچۆنێك هەڵسوکەوت لە خوێندنەوەی بکات بە خوێندنەوەی خوێنەرێك و گوتنەوەی بێژەرێك و لەبەرکردنی لەبەرکەرێك ، وە کاتێك خوێندرایەوە و لە هەموو حاڵەتێکدا گوترایەوە و لەموصحەفەکانی کۆمەڵانی ئیسلام و شێوەی مناڵەکانیان نوسرایەوە ، هەمووی قسەی الله تعالی یە و دروستکراو نییە جا ئەوەی وابزانێت دروستکراوە ئەوا کافرە بە الله تعالی .

---

(4) سورة فصلت : 3 _ 4 .

(5) سورة الشعراء : 192 _ 193 _ 194 _ 195 .

(6) سورة المائدة : 67 .

(7) صحيحه امام احمد لە مەسنەدەکەیدا هێناویەتیەوە (370/23) و ابو داود (4736) والترمذي (2925) و ابن ماجه (4734) بە لەفزی: " قورەیش ڕێگریان لێم کرد لەوەی قسەی خواکەم بگەیێنم " .

## ( وتەی زانایانی ئەهلی سوننە دەربارەی قورئان )

گوێم لە حاکم ئەبو عبد الله الحافظ بوو دەیفەرموو : گوێم لێبووو ئەبو الولید حسان ی کوڕی محمد دەیفەرموو : گوێم لە ئیمام ئەبو بکر محمدی کوڕی إسحاق کوڕی خزیمة بوو دەیفەرموو : قورئان قسەی الله تعالی یە و دروستکراو نییە ، ئەو کەسەی بڵێت قورئان دروستکراوە ئەوا کافرە بە الله تعالی ، شایەدی قبوڵ ناکرێت ، ئەگەر نەخۆش کەوت سەردانی ناکرێت ، ئەگەر مردیش نوێژی لەسەر ناکرێت ، وە لە گۆڕستانی موسڵمانان نانێژرێت ، داوای تەوبەی لێدەکرێت ئەگەر تەوبەی کرد ئەگەرنا لەگەردەنی دەدرێت ) .

بەڵام سەبارەت بە گوتنی دروستکراوی لەفزی قورئان ئەوا شێخ ئەبو بکر الإسماعیلي الجرجاني لە نامەکەیدا کەوا نوسیویەتی بۆ خەڵکی جیلان باسی ئەوەی کردووە و فەرمووویەتی : ( ئەوەی وابزانێت کە دەربڕینی قورئان دروستکراوە و مەبەستی لە دروستکراوی قورئان بێت ئەوا هەمان قسەی قورئان دروستکراوی کردووە ) .

وە ئیبن مهدي الطبري لە کتێبی ( الأعتقاد ) کە نوسیویەتی بۆ خەڵکی ئەم شارە باسی کردووە و فەرموویەتی : ( ڕێبازی ئەهلی سوننەت و جەماعەت ئەوەیە : گوتنی ئەوەی قورئان قسەی الله تعالی یە و نیگا و دابەزێنراویەتی و فەرمان و ڕێگرییەکانیتی ، دروستکراو نییە ، ئەوەشی بڵێت دروستکراوە ئەوا کافرە بە الله تعالی ، وە قورئان لەسینگمان پارێزراوە ، وە بەزوبانمان خوێندراوەتەوە ، لە موصحەفەکانمان دا نوسراوەتەوە ، وە ئەوەش ئەو قسەیەیە کە الله قسەی پێکردووە ، وە ئەوەشی بلێت : قورئان بەدەربڕینی من دروستکراوە یاخود دەربڕینی من بۆ قورئان دروستکراوە ئەوا نەزانە و گومڕایە و کافرە بە الله تعالی ) ، وە ئەو باسەم بەدیاریکراوی لە کتێبەکەی ئیبن مهدي باسکردووە بەهۆکاری چاکیەتی ئەو ، وە ئەو شوێنی سەلەف و هاوەڵانی حەدیث کەوتووە لەوەی

باسـيكردووە لەگەڵ شـارەزاييەكی زۆر لە زانسـتی كەلام و دانراوەكـانی هەيە و نوسراوەكانی زۆرە لەسەر ئەوە و پێشكەوتنی و بەناوبانگی لەلای خەڵكەكەی .

( ئـەبو عبـد الله الحـافظ هەواڵـی پێـداين فەرمـووی : بەڕێنووسـی ئـەبو عمـرو المسـتملي خوێنـدمەوە : گـوێم لە ئـەبو عثمـان سـعيدی كـوڕی إشـكاب بـوو دەيفەرموو: پرسيارم كرد لە إسحاق ـی كوڕی إبراهيم سەبارەت بە لەفزی دەربڕين بە قورئان ؟ فەرمووی : نابێت گفتوگۆ لەسـەر ئەوە بكرێت ، قورئـان قسەی الله تعالی يە دروستكراو نييە )[8] .
محمـدی كـوڕی جرير الطبـري رحمـه الله لەكتێبەكەيـدا ( الأعتقـاد ) كە بـۆ ئەو مەبەستە دايناوە فەرموويەتی : ( بەڵام سەبارەت بە قسەی دەربڕينی بەندەكان بۆ قورئان دروستكراوە ئەوا هيچ ئەثەرێكی لەبارەوە نييە كە بيزانين لە هاوەڵێكەوە يان تابعينەك ، تەنها وتەی ئيمامی دووربين و ڕوونبين كە هيدايەت و ڕێنمونی هەيە لە شـوێنكەوتنيدا ، وە ئەوەشـی كە قسـەكانی دەچێـتە ڕيـزی يەكەمـين و گەورەكـان ، بـاوكی عبـدالله احمـدی كـوڕی حنبـل رحـمه الله ، ( ئـەبو إسـماعيل الترمذي بۆی باسكـردم فەرمـووی : گوێـم لە باوكـی عبدالله احمدی كوڕی حنبل بـوو دەيفەرمـوو : ( لەفزيەكـان جەهميەكـانن ) الله تعـالی فەرمـوويەتی : ( فَأَجِرْهُ حَتَّـىٰ يَسْـمَعَ كَـلَامَ اللَّـهِ )[9] ئايـا لەكێـی گـوێ لێـدەبێت ؟ ، فەرمـووی : گـوێم لە كۆمەڵـيك لەهاوەڵانـم بـوو كە ناوەكانيانـم وەبيرنايـە لێـيەوە بـاس دەكەن كە دەيفـەرمـوو : ( ئەوەی بلێـت دەربـڕينم بـۆ قـورئان دروسـتكراوە ئەوا جەهمـيە ، ئەوەشی بڵێت دروستكراو نييە ئەوا بيدعەچيە ) .

وە محمـدی كـوڕی جريـر فەرمـوويەتی : ( هـيچ قسـەيەك نـيية لامـان دروستبێت بيڵێـين لەو باسـە جـگە لە قسـەكەی ئيمـام احمـد نەبێـت ، ئـەگەر ئيمامێكمـان

---

(8) الأسماء والصفات للبيهقي : (683/2) .
(9) سورة التوبة : 6 .

نەبێـت بـۆ ئەو باســە ئەوا گرنگـی بە قســەکەی ئەو دەدەیـن ، وە لە قســەکەیدا کیفـایەت و قەناعەتــی تێـدایە ، ئەویـش ئیمامــی شـوێنکەوتەیە ، ڕەحمەتـی اللە تعالی و ڕازی بوونی لەسەری بێت ) ئەوە قسەی محمدی کوڕی جریرە کە تاوەکو ئێرە نەقلْم کردووە لە کتێبی ( الأعتقاد ) کە دایناوە .

گوتم : محمدی کوڕی جریر لەو بەشەدا ڕەتی هەموو ئەو قسانەی داوەتەوە لەو کتێبەیدا کە دراوەتە پاڵی لەوەی لە ڕێبازی سوننەت لایداوە یاخود مەیلی بۆ شـتێك لە بیـدعە چووبێـت ، وە ئەوەشـی لە ئیمـامی احمـدەوە باسـی کـرد کە لەفزیەکان جەهمیەکانن ئەوا ڕاست و دروستە ، بەڵکو بۆیە ئەو قسەیەی کردووە چـونکە جەهـم و هـاوەڵانی بەئاشـکرا دروسـتکراوی قورئانیـان دەربڕیـوە ، وە ئەوانەش کە گوتیـان لەفزمـان بـۆ قـورئان دروسـتکراوە بـۆ مەبەسـتی قـورئان دروستکراو بەکاریـان هێنـاوە ، بەهـۆی ترسـانیان بـوو لەئەهلی سوننە لەوەی کە بەڕوونی بڵێن قورئان دروستکراوە ، بۆیە ئەو شێوازی دەربڕینەیان بەکارهێناوە و مەبەسـتیان لەوە بـوو کە گـوتنەوە و دەربڕینـی ئـێمە بـۆ قـورئان دروسـتکراوە ، بەهۆی ئەو هۆکارەوە ئیمام احمد ناویانی ناوە بە جەهمی ، وە لێیەوە باسکراوە کە فەرموویەتی : ( لەفزیەکان زۆر لە جەهمیەکان خراپترن ) .

بەڵام ئەوەی محمدی کوڕی جریـر لە ئیمـامی احمـدەوە باسـی کـردووە کە ئەوەی بڵێت دەربڕینمان بۆ قورئان دروستکراو نییە ئەوا ئەو کەسە بیدعەچییە ، جا ئەوە مەبەستی لەوەیە کە پێشینی ئەهلی سوننە قسەیان لەسەر باسی دەربڕینی قورئان نەکردووە و پێویستیان بە باسکردنی نەبووە ، بەڵکو قسەکردن لەسـەر دەربڕینی قورئان لەلایەن ڕۆچووان و ئەو گەمژانەوەبوو کە داهێنانیان کرد و ئەوەیان داهێنا کە ڕێگریـان لێکـراوە لەوەی دایبهێـنن لە گـومڕایی و خراپـی قسـەکانیان ، وە ململانێیـان لەسـەر شـتانێك کـرد کە ئەهلـی سـوننە و زانایـانی ئیسـلام خۆیـان لێـنەداوە و باسیان نەکردووە ، جا ئیمـامی احمـد فەرموویەتی ئەو قسـەیە خۆی

لەخۆیدا بیدعەیە ، وە هەق وایە کە دەستگرتوو بەسوننەت وازی لێبهێنێت و قسە لەسەر ئەو باسە و هاوشێوەکانی نەکات لە بیدعەی بیدعەچیان ، وە تا ئەو رِادەیە پوختی بکاتەوە کە سەلەف و ئیمامە شوێنکەوتەکان فەرموویانە لەوەی قورئان قسەی الله تعالی یە و دروستکراو نییە و هیچ شتێکی بۆ زیاد نەکات جگە لە تەکفیرکردنی ئەو کەسەی کە بلێت قورئان دروستکراوە .

حاکم ئەبو عبد الله الحافظ هەواڵی پێداین : ئەبوبکر محمدی کورِی عبد الله الخراجي بۆی باسکردین : یحیی ـی کورِی سالوکیە بۆی باسکردین : عبد الكريم السدي بۆی باس کردین فەرمووی : وهب ـی کورِی زمعة فەرمووی : علي باساني هەواڵی پێدام فەرموی : گوێم لە عبد الله ـی کورِی المبارك بوو دەیفەرموو : ( ئەوەی بێباوەرِ بێت بە پیتێك لە قورئان ئەوا بێباوەرِ بووە بە هەموو قورئان ، ئەو کەسەشی بلێت : برِوام بەو قسەیە نییە ئەوا کافرە )[10] .

## ( بیروباوەرِی بەرزبوونەوەی الله تعالی بۆ سەر عەرشی خۆی لەسەرووی ئاسمانەکانی )

وە ئەهلی حەدیث بیروباوەرِیان وایە و شایەدی ئەوە دەدەن کە الله تعالی لەسەرووی حەوت تەبەقەی ئاسمانەکانە و بەرزبووەتەوە بۆ سەر عەرشی خۆی وەك چۆن لە قورئانەکەیدا لەسورەتی الأعراف دا فەرموویەتی : ( إِنَّ رَبَّكُمُ اللَّهُ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ اسْتَوَىٰ عَلَى الْعَرْشِ )[11] ، وە فەرمایشتەکەی لە سورەتی یونس دا : ( إِنَّ رَبَّكُمُ اللَّهُ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ اسْتَوَىٰ عَلَى الْعَرْشِ ۖ يُدَبِّرُ الْأَمْرَ ۖ مَا مِن شَفِيعٍ إِلَّا مِن بَعْدِ إِذْنِهِ ۚ )[12] ، وە فەرمایشتەکەی لە سورەتی الرعد دا : ( اللَّهُ الَّذِي رَفَعَ السَّمَاوَاتِ

(10) إبن تيمية لێیەوە نەقڵ دەکات لە مجموع الفتاوى : (109/4) .
(11) سورة الأعراف : 54 .
(12) سورة يونس : 3 .

بِغَيْرِ عَمَدٍ تَرَوْنَهَا ۖ ثُمَّ اسْتَوَىٰ عَلَى الْعَرْشِ )[13] وه فەرمایشتەکەی لە سورەتی الفرقان دا : ( ثُمَّ اسْتَوَىٰ عَلَى الْعَرْشِ ۚ الرَّحْمَٰنُ فَاسْأَلْ بِهِ خَبِيرًا )[14] ، وه فەرمایشتەکەی لەسورەتی السجدة دا : ( ثُمَّ اسْتَوَىٰ عَلَى الْعَرْشِ )[15] ، وه فەرمایشتەکەی لە سورەتی طە دا : ( الرَّحْمَٰنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَىٰ )[16] .

وه الله تعالی دەربارەی فیرعەون ڕایگەیاندووە کە بە هامانی گوتووە : ( ابْنِ لِي صَرْحًا لَّعَلِّي أَبْلُغُ الْأَسْبَابَ * أَسْبَابَ السَّمَاوَاتِ فَأَطَّلِعَ إِلَىٰ إِلَٰهِ مُوسَىٰ وَإِنِّي لَأَظُنُّهُ كَاذِبًا ۚ )[17] ، وە بۆیە ئەو قسەیەی کرد چونکە گوێی لە موسی علیه الصلاة والسلام بوو باسی دەکرد کەوا خواکەی لە ئاسمانە ، ئایا سەیری قسەکەیت نەکردووە : ( وَإِنِّي لَأَظُنُّهُ كَاذِبًا ) ، واتە : لەوتەکەی : کە خوایەك هەیە لە ئاسمان .

## ( وتەی زانایانی سەلەف لەسەر جێگیرکردنی بەرزبوونەوەی الله تعالی بۆ سەر عەرشی خۆی )

وه زانایانی شارەزا و تاك تاكی زانایانی سەلەف ڕەحمەتی الله لەسەریان ڕاجیاییان نەبووە لەوەی کە الله تعالی لەسەر عەرشی خۆیەتی و عەرشەکەی لەسەرووی ئاسمانەکانە ، ئەوە جێگیر دەکەن کە الله تعالی جێگیری کردووە و بڕوای پێدەهێنن و الله تعالی بەڕاست دادەنێن لە هەواڵدانەکانی ، وە ئەوە دەردەبڕن کە الله تعالی دەربیڕیووە لەبەرزبوونەوەی بۆ سەر عەرشی خۆی و لەسەر ڕووکەشەکەی بەڕێی دەکەن و زانستەکەی بۆ لای الله تعالی دەگەڕێننەوە ، وە

(13) سورة الرعد : 2 .
(14) سورة الفرقان : 59 .
(15) سورة السجدة : 4 .
(16) سورة طه : 5 .
(17) سورة غافر : 36 _ 37 .

دەڵێن : ( آمَنَّا بِهِ كُلٌّ مِّنْ عِندِ رَبِّنَا ۗ وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّا أُولُو الْأَلْبَابِ )[18] ، وەك الله تعالى باسی ڕۆچووان لەزانست و شارەزایانی كردووە كە وادەڵێن و لێیان ڕازی بوو و ستایشی كردوون لەسەر ئەوە .

**( وتەی أم سلمة لەسەر بەرزبوونەوەی الله تعالى بۆ سەر عەرشی خۆی )**

ئەبو الحسن عبد الرحمن ــی كوڕی إبراهیم ــی كوڕی محمدی كوڕی یحیــی ــی المزكي هەواڵی پێداین : محمدی كوڕی داودی كوڕی سلیمان الزاهد بۆی باس كردین: علي كوڕی محمدی كوڕی عبید ئەبو الحسن هەواڵی پێدام : ئەبو یحیــی ــی كوڕی كیسة الوراق بۆی باسكردین : محمدی كوڕی الأشرس الوراق ئەبو كنانة بۆی باس كردین : ئەبو المغیرة الحنفي بۆی باسكردین : قرة ــی كوڕی خالد لە الحسن ــەوە بۆی باس كردین لە دایكیەوە لە أم سلمة سەبارەت بە وتەی الله تعالى : ( الرَّحْمَٰنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَىٰ )[19] فەرمووی : بەرزوونەوە زانراوە و چۆنیەتیەكەی ئەقڵ تەدەبوری ناكات ، وە دان پێنانیشی ئیمانە ، وە نكۆڵی لێكردنیشی كوفرە )[20] .

**( وتەی مالكی كوڕی أنس لەسەر بەرزبوونەوەی الله تعالى بۆ سەر عەرشی خۆی )**

وە ئەبو الحسن ــی كوڕی إسحاق المدني بۆی باسكردین : أحمدی كوڕی الخضر ئەبو الحسن الشافعي بۆی باسكردین : شاذان بۆی باسكردین : ئیبن مخلدی كوڕی یزید القهستاني بۆی باسكردین : جعفری كوڕی میمون بۆی باسكردین فەرمووی : پرسیاركرا لە مالكی كوڕی انس دەربارەی وتەی الله تعالى : ( الرَّحْمَٰنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَىٰ )[21] چۆن بەرزبویەوە ؟ فەرمووی : بەرزبوونەوە زانراوە ، وە چۆنیەتیەكەی ئەقڵ تەدەبوری ناكات ، وە ئیمان هێنان پێی واجبە ، وە

(18) سورة آل عمران : 7 .
(19) سورة طه : 5 .
(20) شرح أصول أعتقاد أهل السنة والجماعة للالكائي : ( 440/3 ) وە الإبانة الكبرى لإبن بطة: ( 162/7 ) .
(21) سورة طه : 5 .

پرسیارکردن لەبارەی بیدعەیە ، وە تۆ نابینم لە گومڕایەك زیاتر بیت ) فەرمانی کرد لە کۆڕەکەیدا دەربکرێت .

ئەبو محمد المخلدي بۆی هەواڵــی پێداین : ئەبوبکر عبد الله ــی کوڕی محمــدی کوڕی مسلــم الإسفرایینــي بۆی باس کردیــن : ئەبو الحسین علي کوڕی الحسن بۆی بـاس کـردین : سـلمة ــی کـوڕی شـبیب بـۆی بـاس کردیــن : مهدي کــوڕی جعفـری کوڕی میمون الرملي بۆی باسکردین لە جعفری کوڕی عبد الله فەرمووی : ( پیاوێك هات بۆ لای مالکی کوڕی انس پرسیاری کرد دەربارەی ئایەتی : ( الرَّحْمَٰنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَىٰ )[22] چۆن بەرزبویەوە ، فەرمووی : نەم بینی شتێکی ئاوای دیتبێــت لەوەی بینــی لە قسەکەیـــدا ، وە ئارەقە دایگـــرت و خەڵکەکـــەش چـاوەڕێی وەڵامـی مالیکیـان دەکـرد ، ئینجـا ئیمـام مالیـك فەرمـووی : ( چـۆنیەتی نەزانــراوە ، وە بەرزبوونەوەکەشــی زانــراوە ، وە ئیمــان هێنــان پێــی واجــبە ، وە پرســیارکردنیش لەســەری بیــدعەیە ، دەترســم لەوەی کە گــومڕا بــووبێتی ) دوای ئەوەی فەرمانی کرد بچێتە دەرەوە .

وە بـاپیرم ئــەبو حامـد أحمـدی کـوڕی إسـماعیل پێـی ڕاگەیانـدم لە بـاپیری بـاوکی شــەهیدمەوە و ئــەبو عبــد الله محمــدی کــوڕی عــدي کــوڕی حمدویــة الصــابوني : محمدی کوڕی أحمدی کوڕی أبي عون النسوي بۆی باسکردین : سلمة ــی کوڕی شبیب بۆی باسکردین : مهدي کوڕی جعفر الرملي بۆی باسکردین : جعفری کوڕی عبدالله بۆی باسکردین فەرمووی : پیاوێك هات بۆ لای مالکی کوڕی ئەنەس گوتی ئەوی باوکی عبدالله ( الرَّحْمَٰنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَىٰ )[23] چۆن بەرزبوویەوە بۆ سەر عەرش ؟ گـوتی : نەم بینـی شـتێکی ئاوای دیتبێـت لەوەی بینـی لە قسـکەیدا ، وە بەهەمان شێوە باسی کرد .

---

(22) سورة طه : 5 .

(23) سورة طه : 5 .

## ( وتەی حسين ی كوڕی الفضل لەسەر بەرزبوونەوەی الله تعالى بۆ سەر عەرشی خۆی )

وە پرسیارکرا لە ئەبو علي الحسين ی كوڕی الفضل البجلي : ( سەبارەت بە بەرزبوونەوەی الله بۆ سەر عەرش ، وە پێی گوترا : چۆن بەرزبوویەوە بۆ سەر عەرش ؟ فەرمووی : من هەواڵی غەیب نازانم جگە لەو ڕادەیەی کە بۆمان ڕوونکراوەتەوە ، وە الله تعالى پێمانی فەرمووە کە بەرزبوەتەوە بۆ سەر عەرشی خۆی ، وە باسی چۆنیەتی بەرزبوونەوەکەی بۆمان باسنەکردووە )[24] .

## ( وتەی عبدالله ی كوڕی مبارك لەسەر بەرزبوونەوەی الله تعالى بۆ سەر عەرشی خۆی )

( ئەبو عبد الله الحافظ پێی ڕاگەیاندین : ئەبو بكر محمدی كوڕی داود الزاهد پێی ڕاگەیاندین : محمدی كوڕی عبد الرحمن السامي پێی ڕاگەیاندین : عبد الله ی كوڕی أحمدی كوڕی شبويه المروزي بۆی باس كردم : گوێم لە علي كوڕی الحسين ی كوڕی شقيق بوو دەیفەرموو : گوێم لە عبد الله ی كوڕی المبارك بوو دەیفەرموو : خوای خۆمان دەناسین کە لەسەرووی حەوت تەبەقەی ئاسمانە و بەرزبووەتەوە بۆ سەر عەرشی خۆی بەتاڵە لەدروستکراوەکانی ، وە ناڵێین لێرەیە وەك جەهمیەکان گوتیان ئاماژەی بۆ زەوی دا )[25] .

## ( وتەی ئیبن خزیمة لەسەر بەرزبوونەوەی الله تعالى بۆ سەر عەرشی خۆی )

وە گوێم لێبوو حاكم ئەبو عبد الله لەکتێبی ( التاريخ ) کە ئامادەی کردبوو بۆ خەڵکی نیسابوور ، وە لە کتێبی ( معرفة الحديث ) کە هاوشێوەی کۆکراوەکانی نییە دەیفەرموو : گوێم لە ئەبو جعفر محمدی كوڕی صالحی كوڕی هانئ بوو

---

(24) خطیبی بەغدادی لە تاریخەکەیدا هێناویەتیەوە : (75،76/13)، و ذهبي لە السير دا : (97/9)، وە لە العلو دا : (161) بە پوختی .

(25) عبدالله هێناویتیەوە لە سونەتدا بەژمارە (216) لە باویکیەوە لە عبد الله ابن أحمد بن شبويه . . . . . . . . . . ، وە بيهقی لە الأسماء والصفات و بوخاری لە خلق أفعال العباد و وابن القيم لە الصواعق المرسلة بە لەفەزی جیاواز .

دەيفەرموو : گوێم لە ئەبو بكر محمدی كوڕی إسحاقی كوڕی خزيمة دەيفەرموو: ( ئەوەی نەڵێت الله تعالی لەسەر عەرشی خۆیەتی و بەرزبووەتەوە سەر سەرووی حەوت تەبەقەی ئاسمان ئەوا كافرە بە الله و خوێنی حەڵالە ، داوای تەوبەی لێدەكرێت جا ئەگەر تەوبەی كرد ئەگەرنا لە گەردنی دەدرێت و فڕێ ئەدرێتە ناو مەزبەڵەوە تاوەك موسڵمانان و پەیمانپێدراوان ئازار نەدرێن بەهۆی بۆنی تەرمە بۆگەنەكەیەوە ، وە سامانەكەشی بۆ كۆمەڵەی موسڵمانانە و هیچ كەسێك لە موسڵمانان نابنە میراتگری ، چونكە موسڵمان نابێتە میراتگری كافر وەك پێغەمبەری الله ( صلى الله عليه وسلم ) فەرموویەتی : ( نە موسڵمان میرات لە كافر دەبات نەكافریش لە موسڵمان )[26] )[27] .

## ( وتەی شافعی لەسەر بەرزبوونەوەی الله تعالی بۆ سەر عەرشی خۆی )

وە ئیمامان ئەبو عبد الله محمدی كوڕی إدريس الشافعي الله تعالی لێی ڕازی بێت پشتی بەستووە لەكتێبە لە باسی ئازادكردنی بەندەی ئیماندار بۆ لاچوونی گوناه و تاوان ، وە جگە لە ئازادكردنی بەندەی ئیماندار دروست نییە بۆ لاچوونی تاوان ، بە ڕاگەیاندنەكەی معاوية ـی كوڕی الحكم ، كە ویستی كەنیزەیەكی ڕەشپێست ئازاد بكات بۆ لاچوونی تاوانەكانی ، وە پرسیاری كرد لە پێغەمبەری الله ( صلى الله عليه وسلم ) سەبارەت بە ئازادكردنی ، پێغەمبەری الله ( صلى الله عليه وسلم ) تاقیكردنەوەی پێ كرد ، پێی فەرموو : ( من كێم ؟ ئاماژەی بۆ پێغەمبەری الله ( صلى الله عليه وسلم ) و بۆ ئاسمان كرد ، مەبەستی ئەوە بوو : كە تۆ پێغەمبەری ئەو خوایەی كە لە ئاسمانە ، جا پێغەمبەری الله ( صلى الله عليه وسلم ) پێی فەرموو : ( ئازادی بكە ئیماندارە ) پێغەمبەری الله ( صلى الله عليه وسلم ) حوكمی ئیسلامبوون و ئیمانیدا كاتێك كە دانی نا بەوەی كە الله لە

(26) صحيح البخاري : (8 / 156) ، ( 6764 ) ، ومسلم : (3 /1233) (1614) .

(27) كتاب التوحيد لإبن خزيمة .

ئاسمانە ، وە خوای خۆی ناسی بە سیفەتی بەرزبوونەوە و بەرزیەتی ، بەڵکو شافعی ڕەحمەتی الله لەسەری بێت پشتی بەو فەرموودەیە بەستووە بەرامبەر بەپێچەوانان لەو قسەیەیان کەوا دروستە ئازادکردنی بەندەی کافر بۆ لاچوونی تاوان و گوناهـ ، بەو فەرموودەیە بەهۆی ئەوەی بەندەکە بڕوای هەبوو بەوەی الله تعالی لەسەرووی دروستکراوەکانیەتی و لەسەرووی حەوت تەبەقەی ئاسمانەکانە و لەسەر عەرشی خۆیەتی ، وەك چۆن ئەوە بیروباوەڕی موسڵمانانە لە ئەهلی سوننەت و جەماعەت لە پێشینانیان تا دواییەکانیان ، جا ئەگەر شافعی ڕەحمەتی الله لەسەری بێت وابوایە ئەوا هەواڵێکی ڕاست و دروستی نەدەهێنایەوە و پشتی پێ نەدەبەست .

حاکم ئەبو عبد الله پێی ڕاگەیاندین فەرمووی : ئیمام ئەبو الولید حسان ـی کوڕی محمد الفقیه پێی ڕاگەیاندین فەرمووی : إبراهیمی کوڕی محمود بۆی باسکردین فەرمووی : گوێم لە ربیعی کوڕی سلیمان بوو دەیفەرموو : گوێم لە شافعی بوو ڕەحمەتی الله لەسەری بێت دەیفەرموو : ( ئەگەر منتان بینی قسەیەك بکەم و لەهەمان کاتدا بە پێچەوانەی قسەکەی من لە پێغەمبەری الله وە بەدروستی هاتبێت ئەوا بزانن کە ئەقڵم نەماوە )[28] .

حاکم فەرموویەتی : جگە لەجارێك گوێم لە ئەبو الولید بوو دەیفەرموو : لە زعفرانیەوە بۆم باسکرا کە شافعی ڕۆژێك فەرموودەیەکی گێڕایەوە جا پرسیارکەر گوتی : ئەی باوکی عبدالله ئایا هەمان ئەو قسەیە دەکەیت ؟ فەرمووی : لە بازاڕ دەمبینیت یان لە کەنیسە ؟ ئایا دەبینی جلی کافرانم پۆشیبێت ؟ ئەوە خۆت لە مزگەوتی موسڵمانان دەمبینیت بە پۆشاکی موسڵمانانەوە ، ڕووم کردووەتە قیبلەیان ، ئایا فەرموودەیەك لە پیغەمبەری الله ( صلی الله علیه وسلم ) وە دەگێڕمەوە و دواتر وەری نەگرم و هەمان قسە نەکەم ؟ .

(28) آداب الشافعي لاپەڕە (93) .

## ( جياوازی نێوان ئەهلی سوننە و ئەهلی بیدە ع لەباسی سیفاتدا )

جیاوازی نێوان ئەهلی سوننە و ئەهلی بیدە ع ئەوەیە کە ئەهلی بیدە ع کاتێك هەواڵێکیان پێ بگات سەبارەت بە سیفاتەکانی الله ئەوا لەبنەڕەتدا ڕەتی دەکەنەوە و قبوڵی ناکەن و لەسەر ڕووکەشەکەی لایدەبەن و دواتر تەئویلی دەکەن و بە تەئویلێك کە مەبەستیان لێی لابردنی هەواڵەکەیە لە بنەڕەت و مەبەستەکەیدا ، وە پوچەڵ کردنەوەی هەواڵەکە بە ئەقڵ و بۆچوونی خۆیان ، وە یەقینیان هەیە وە دەزانن کە ئەوەی پێغەمبەری الله فەرموویەتی لەسەر ئەو مەبەستەیە کە فەرموویەتی ، چونکە ئەو لەهەموو کەس خواکەی خۆی باشتر دەناسی ، وە جگە لە ڕاستی و بە وەحی هیچ شتێکی نەگووتووە لەسەر الله ، الله تعالی فەرموویەتی : ( وَمَا يَنْطِقُ عَنِ الْهَوَى * إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَى )[29] .

ئیمامی زانایان زوهری و جگە لەویش لە زانایانی ئوممەت الله لێیان ڕازی بێت فەرموویانە : ( لەسەر الله ڕوونکردنەوەیە ، وە لەسەر پێغەمبەریش گەیاندنە ، وە لەسەر ئێمەش تەسلیم بوونە )[30] .

یونسی کوڕی عبد الصمدی کوڕی معقل گێڕاویەتییەوە لە باوکیەوە کەوا جەعدی کوڕی درهەم هات بۆ لای وەهبی کوڕی مونەبیهـ پرسیاری سیفاتەکانی الله تعالی ـی لێکرد ، وەهب فەرمووی : وەیل بۆت ئەی جەعد تەنها ئەو باسانە ! من لە هیلاکچوانت دەبینم ، ئەی جەعد ، ئەگەر الله تعالی لە قورئانەکەیدا پێمانی نەگوتبێت دوو دەست و چاو و ڕووی هەیە ئەوا ئێمەش وامان نەدەگوت ، لە الله بترسە ، ئینجا جعد چاوەڕێی چی دەکرد ئەگەر بکوژرابوایە یان لە خاچ بدرایە .

وە خالدی کوڕی عبد الله القسري ڕەحمەتی الله تعالی لەسەری لەجەژنی قورباندا لە بەصرادا وتاری دا و فەرمووی : الله بەرەکەت بەسەر قوربانیەکانتاندا بڕژێنێت ،

---

(29) سورة : 3 ـــ 4 .

(30) ئەوە وتەیە جێگیر بووە لە زوهریەوە وە بەغەوی هێناویەتیەوە لە شرح السنة : (171/1) .

مـن ئەمـڕۆ قوربـانی بە جەعـدی کـوڕی درهەم دەکەم ، چـونکە دەلێـت : الله ئیبراهیمـی نەکـردووە بەدۆسـتی خـۆی ، وە بەقسـەکردن قسـەی لەگەڵ موسـی نەکردووە ، پاك و بێگەردی و بەرزی بۆ الله تعالی لەوەی جەعد دەیلێت ، دوای ئەوە لەسەر مینبەر دابەزی و بەدەستەکانی سەری جەعدی بڕی و فەرمانی کرد بە لە خاچ دانی .

## ( جێگیرکردنی سیفەتی دابەزین و هاتن )

وە هـاوەڵانی حەدیـث سـیفەتی دابەزینـی الله تعـالی هەمـوو شـەوێك بـۆ ئاسـمانی دونیـا جێگیـر دەکەن ، بەبـێ چوواندن و چـۆنیەتی و هاوتـاکردنی بە دابەزینـی دروسـتکراوەکان ، بەڵکـو ئەوەنـدە جێگیـر دەکەن کە پێغەمـبەری الله ( صـلی الله علیـه وسـلم ) جێگیـری کردووە لەو ڕادەیە کۆتـایـی پـێ دەهێنن ، وە ئەو هەواڵ و فەرموودە صحیحانە کە باسی ئەو سیفەتە دەکەن بەڕێ دەکەن لەسـەر ڕووکەشی خۆی و زانستەکەی بۆ الله تعالی دەگەڕێننەوە .
بەهەمان شێوە ئەوە جێگیر دەکەن کە الله تعـالی لەکتێبەکەیدا دایبەزانـدووە لە باسـی هـاتن ( المجـيء والإتيـان ) ـی الله تعـالی کە لەفەرمایشـتی الله تعـالی دا باسکراوە : ( هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا أَن يَأْتِيَهُمُ اللَّهُ فِي ظُلَلٍ مِّنَ الْغَمَامِ وَالْمَلَائِكَةُ )[31] ، وە فەرمایشتی : ( وَجَاءَ رَبُّكَ وَالْمَلَكُ صَفًّا صَفًّا )[32] .

وە لە نامەکەی شێخ ئەبو بکر الإسماعيلي بۆ خەڵکی جیلان خوێندمەوە کە الله تعـالی دادەبەزێـت بـۆ ئاسـمانی دونیـا لەسـەر ئەو هەواڵە دروسـتانەی کە لە پێغەمـبەری الله وە هـاتووە ، وە الله تعـالی فەرموویەتـی : ( هَـلْ يَنظُـرُونَ إِلَّا أَن يَأْتِيَهُمُ اللَّهُ فِي ظُلَلٍ مِّنَ الْغَمَامِ )[33] ، وە فەرموویەتـی : ( وَجَاءَ رَبُّكَ وَالْمَلَكُ صَفًّا

(31) سورة البقرة : 210 .
(32) سورة الفجر : 22 .
(33) سورة البقرة : 210 .

صَفًّا )[34] ئيمان بەهەمووی دەهێنین لەسەر ئەو شێوازەی کە هاتووە بەبێ چۆنیەتی ، وە ئەگەر الله تعالى ویستی لەسەر ڕوونکردنەوەی چۆنیەتیەکەی هەبوایە بۆمان ئەوا باسی دەکرد ، ئێمەش لەووە کۆتاییمان پێ هێناوە کە حوکمی داوە ، وە دەستمان هەڵگرتووە لەوەی کە مانای جۆراوجۆر و فراوان دەدەن بەدەستەوە ، لەکاتێکدا کە فەرمانمان پێکراوە بەو دەستهەڵگرتن و وازهێنانە لەوتەی الله تعالى : ( هُوَ الَّذِي أَنزَلَ عَلَيْكَ الْكِتَابَ مِنْهُ آيَاتٌ مُّحْكَمَاتٌ هُنَّ أُمُّ الْكِتَابِ وَأُخَرُ مُتَشَابِهَاتٌ ۖ فَأَمَّا الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ زَيْغٌ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَابَهَ مِنْهُ ابْتِغَاءَ الْفِتْنَةِ وَابْتِغَاءَ تَأْوِيلِهِ ۗ وَمَا يَعْلَمُ تَأْوِيلَهُ إِلَّا اللَّهُ ۗ وَالرَّاسِخُونَ فِي الْعِلْمِ يَقُولُونَ آمَنَّا بِهِ كُلٌّ مِّنْ عِندِ رَبِّنَا ۗ وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّا أُولُو الْأَلْبَابِ )[35] .

## ( ڕێگری لە پرسیارکردن دەربارەی چۆنیەتی دابەزینی الله تعالى )

ئەبوبکری کوڕی زکریا الشيباني پێی ڕاگەیاندین : گوێم لە ئەبو حامدی کوڕی الشرقي بوو دەیفەرموو : گوێم لە أحمد السلمي و ئەبو داود الخفاجي بوو دەیان فەرموو : گوێمان لە إسحاقی کوڕی إبراهيم الحنظلي بوو دەیفەرموو : ئەمیر عبدالله ــی کوڕی طاهر پێی گوتم : ئەی أبو یعقوب ئەو فەرموودەیەی لە پێغەمبەری الله وە (صلى الله عليه وسلم ) دەیگێڕێتەوە : ( پەروەردگارمان هەموو شەوێك بۆ ئاسمانی دونیا دادەبەزێت ) جا چۆن دادەبەزێت ؟ فەرمووی : گوتم : الله ئەمیر ڕێزدار بکات ، چۆن و چۆنیەتی بەفەرمانی الله ناگوترێت ، بەڵکو بەبێ چۆن و چۆنیەتی دادەبەزێت ).

ئەبو یعقوب إسحاقی کوڕی إبراهيم بۆی باسکردین : محبوبی کوڕی عبد الرحمن القاضي بۆی باسکردین : ئەبوبکری کوڕی أحمدی کوڕی محبوب بۆی باسکردم : أحمدی کوڕی حمويه بۆی باسکردم : ئەبو عبد الرحمن العباسي بۆی باسکردم :

---

(34) سورة الفجر : 22 .

(35) سورة آل عمران : 7 .

محمدی كوڕی سلام بۆی باسكردم فەرمووی : ( پرسیارم كرد لە عبد الله ـی كوڕی المبارك دەربارەی دابەزینی الله لە نیوەی شەوی شەعباندا ، جا عبدالله ـی كوڕی مبارك فەرمووی : هەی لاواز ، شەوی نیوەی شەعبان دادەبەزێت ؟ بەڵكو لە هەموو شەوێكدا دادەبەزێت ، جا پیاوەكە فەرمووی : ئەی باوكی عبدالله : چۆن دادەبەزێت ؟ ئایا شوێنەكەی بەتاڵ نامێنێتەوە ؟ ئیبن مبارك فەرمووی : چۆن خۆی ویستی لەسەر بێت دادەبەزێت ).

وە لەگێڕانەوەیەكی تردا هەر دەربارەی ئەو ڕووداوە عبدالله ـی كوڕی مبارك بە پیاوەكەی فەرمووە : ( ئەگەر فەرموودەت لە پێغەمبەری الله ( صلى الله عليه وسلم ) وە پێگەشت ئەوا ملكەچی ببە ) .

گوێم لە حاكم ئەبو عبد الله الحافظ بوو دەیفەرموو : گوێم لە ئەبو زكريا يحيى ـی كوڕی محمد العنبري بوو دەیفەرموو : گوێم لە إبراهيمی كوڕی أبي طالب بوو دەیفەرموو : گوێم لە أحمدی كوڕی سعيدی كوڕی إبراهيمی كوڕی عبد الله الرباطي بوو دەیفەرموو : ڕۆژێكیان لە كۆڕی ئەمیر عبد الله ـی كوڕی طاهر ئامادەبووم إسحاقی كوڕی راهويه هاتە كۆڕەكەوە و دەربارەی فەرموودەی دابەزین پرسیاری لێكرا : ئایا صحیحە ؟ فەرمووی : بەڵێ ، هەندێك لە لایەنگرانی ئەمیر گوتیان : ئەی باوكی عبدالله ، ئایا بانگەشەی ئەوە دەكەیت الله هەموو شەوێك دادەبەزێت بۆ ئاسمانی دونیا ؟ فەرمووی : بەڵێ ، گووتی : چۆن دادەبەزێت ؟ إسحاق پێی فەرموو : ئەوە جێگیر بكە كە الله لە سەرەوەیە تاوەك وەسفی دابەزینەكەت بۆ بكەم ، پیاوەكە گوتی : داندەنێم بەوەی كە لە سەرەوەیە ، جا إسحاق پێی فەرموو : الله تعالى فەرموویەتی : ( وَجَاءَ رَبُّكَ وَالْمَلَكُ صَفًّا صَفًّا )[36] ، ئەمیر گوتی: ئەی باوكی يعقوب ، ئەوە ڕۆژی قیامەتە ، إسحاق فەرمووی : الله

---

36 سورة الفجر : 22

ئەمیر ڕێزدار بکات ، جا ئەگەر لەڕۆژی قیامەتدا بێت ئەی ئەمڕۆ کێ ڕێگری لێدەکات ؟ .

## ( باسی هەواڵی دابەزین بەشێوەی متەواتر )

وە هەواڵی دابەزینی الله لەهەموو شەویێکدا بۆ ئاسمانی دونیا هەواڵێکە کۆدەنگی هەیە لەسەر صحیحیەتی ، لەهەردوو کتێبی صحیحەکەشدا هاتووە ، لە ڕێگای مالکی کوڕی ئەنەس لە زوهریەوە لە ئەغەر و باوکی سەلەمەوە لە ابو هریرەوە .

ئەبو علي زاهری کوڕی أحمد پێی ڕاگەیاندین : ئەبو إسحاق إبراهیمی کوڕی عبدالصمد بۆی باسکردین : ئەبو مصعب بۆی باس کردین : مالك بۆی باس کردین : ئەبوبکری کوڕی زکریا بۆی باسکردین : ئەبو حاتم علي کوڕی عبيدان بۆی باسکردین : محمدی کوڕی یحیی بۆی باسکردین فەرمووی : لەو شتانەی کە بۆ ئیبن نافع ــم خوێندەوە : مطرف بۆی باسکردم لە مالیکەوە وە ئەبوبکری کوڕی زکریا بۆی باسکردین : ئەبو القاسم عبيد الله ــی کوڕی إبراهیمی کوڕی باکویە پێی ڕاگەیاندین : یحیی ــی کوڕی محمد بۆی باسکردین : یحیي ــی کوڕی یحیی بۆی باسکردین فەرمووی : بۆ ئیمامی مالیکم خوێندەوە : لە ئیبن شهاب الزهریەوە لە ئەبو عبد الله الأغرو و ئەبو سلمة لە ئەبوهریرة وە ڕەزای الله لەسەری بێت کەوا پێغەمبەری الله ( صلى الله عليه وسلم ) فەرموویەتی : ( پەروەردگارمان لە هەموو شەویێکدا دادەبەزێت بۆ ئاسمانی دونیا کاتێك کە سێیەکی کۆتایی شەو دەمێنێت ، دەفەرمووێت : کێ لێم دەپاڕێتەوە تاوەك وەڵامی بدەمەوە ، وە کێ داوام لێدەکات تاوەك پێی ببەخشم ، وە کێ داوای لێخۆشبوونم لێدەکات تاوەکو لێی خۆشببم ) .

وە ئەو فەرموودەیە ڕێگایەکیشی هەیە لە ئەبو هریرة وە ، ئەوزاعي ڕیوایەتی کردووە لە یحیی ــی کوڕی أبي کثیر لە ئەبو سلمة لە ئەبو هریرة وە ، وە یزیدی کوڕی هارون و جگە لەویش ڕیوایەتیان کردووە لە محمدی کوڕی عمرو لە ئەبو

سلمة وه له ئەبو هريرةوه ، وه ماليك له زوهريەوه له ئەعرجەوه له ئەبو هريرةوه ، وه ماليك له زوهريەوه له سعيدى كوڕى ئەبو سعيد المقبريەوه له ئەبو هريرةوه ، وه ماليـك له زوهريـــەوه له سـعيدى كـوڕى المسـيبەوه له ئـەبو هريـرەوه ، وه عبيدالله ـى كوڕى عمر له سعيدى كوڕى أبي سعيد المقبري له ئەبو هريرەوه ، وه عبد الأعلى كوڕى ئـەبو المساور و بشيرى كوڕى ئـەبو سلمان له أبي حازمەوه له ئەبو هريرةوه ، وه نافعى كوڕى جبيرى كوڕى مطعم لەباوكيەوه گيڕاويەتيەوه ، وه موسى ـى كوڕى عقبة له إسحاقى كوڕى يحيى ـەوه له عبادةى كوڕى الصامتەوه ، عبد الرحمن ـى كوڕى كعب ـى كوڕى مالك له جابرى كوڕى عبد الله ـەوه ، وه عبيد الله ـــى كـوڕى ئـەبو رافـع له علي كـوڕى ئـەبو طـالبەوه ، وه شـريك له ئـەبو إسحاق له ئـەبو الأحـوص له عبـد الله ـــى كـوڕى مسعودەوه ، وه محمـدى كـوڕى كعـب ـــى كـوڕى فضـالەى كـوڕى عبيـد له ئـــەبو دردائەوه ، وه ئـەبو الزبيـر له جـابرەوه ، وه سـعيدى كـوڕى جبيـر له ئيـبن عباسـەوه و له عائشــەى دايكـى ئيمانداران و دايكى سلمة ڕەزاى الله لەسەريان بێت ، هەموويان له پێغەمبەرى الله وه ( صلى الله عليـه وسـلم ) كەوا فەرمـوويەتى : ( الله تعـالى هەمـوو شـەوێك كاتێـك كەوا سـێيەكى كۆتـايى شـەو دەمێنێـت دادەبەزێـت بـۆ ئاسـمانى دونيـا و دەفەرمووێـت : كـێ داوام لێـدەكات تـاوەكو پێـى ببەخشـم ؟ كـێ لێمـدەپاڕێتەوه تــاوەكو وەڵامــى بــدەمەوه ؟ كــێ داواى لێخۆشــبوونم لێــدەكات تــاوەكو لێــى خۆشببم ؟ ) ، بەهۆى ئەوەوه نوێژى كۆتايى شەويان بەباشتر دادەنا لەيەكمى ، وه ئەو ڕێگايانەش تێكـڕايان بەسەنــەدى خۆى دەرهێنراون له كتێبه گەورەكـەمـان كەوا ناسراوه به ( الأنتصار ) .

وه له ڕيوايەتى ئـەوزاعي له محمدى كوڕى عمرو له ئـەبو سلمة له ئـەبو هريـرەوه ڕەزاى الله لەســەرى بێــت ، لەپێغەمــبەرى الله وه ( صــلى الله عليــه وســلم ) فەرمـوويـەتـى : ( كاتێك كه نيوەى شەو ياخود سێيەكى تەواو دەبێت الله تعالى دادەبەزێت بۆ ئاسمانى دونيا و دەفەرمووێت : هيچ داواكارێك هەيه تاوەك پێى

ببەخشرێت ؟ هیچ کەسێك هەیە بپاڕێتەوە تاوەك وەڵامی بدرێتەوە ؟ هیچ داواکەرێکی لێخۆشبوون هەیە تاوەك لێی خۆش ببێت ؟ تاوەك بەیانی بەسەردا دێت )[37] .

وە لە ڕیوایەتی سعیدی کوڕی مرجانة لە ئەبو هریرەوە زیادەیەك لەکۆتاییەکەیدا: ( ئینجا دەستەکانی فراوان دەکات و دەفەرمووێت : کێ قەرز ئەدات بە خوایەکی دەوڵەمەند و دادوەر )[38] .

وە لە ڕیوایەتی ئەبو حازم لە ئەبو هریرەوە لە پێغەمبەری الله وە ( صلى الله عليه وسلم ) : ( الله تعالى لەکۆتایی سێیەکی شەودا دادەبەزێت بۆ ئاسمانی دونیا و بانگدەکات : هیچ داواکەرێك هەیە تاوەکو پێی ببەخشم ؟ هیچ داواکەرێکی لێخۆشبوون هەیە تاوەك لێی خۆش ببم ؟ هیچ شتێك نییە کە ڕۆحی تێدا بێت ئیللا بەوە دەزانێت ، تەنیا گرۆی ئادەمیزاد و جنەکان نەبن فەرمووی : ئەویش ئەو کاتەیە کە کەڵەشێرەکان بانگ دەدەن گوێدرێژەکان دەزەڕن و سەگەکان دەوەڕن )[39] .

وە لەڕیوایەتی موسى ـی کوڕی عقبة لە إسحاقی کوڕی یحیى ـەوە لە عبادة ـی کوڕی الصامت هەندێك زیادەی حسنی تێدایە ئەویش ئەوەیە ئەبو یعلى حمزة ـی کوڕی عبد العزيز المهلبي پێی ڕاگەیاندین : عبد الله ـی کوڕی محمد الرازي هەواڵی پێداین : ئەبو عثمان محمدی کوڕی عثمان ـی کوڕی ئەبو سوید هەواڵی پێداین : عبدالرحمن بۆی باس کردین — واتە : ئیبن المبارك - : فضیل ـی کوڕی سلمان بۆی باس کردین لە موسى ـی کوڕی عقبەوە لە إسحاقی کوڕی یحیى ـەوە لەعبادة ـی کوڕی الصامتەوە الله لێی ڕازی بێت فەرمووی : پێغەمبەری الله ( صلى

---

(37) صحيح مسلم : (758) .

(38) صحيح مسلم : (758) .

(39) الفردوس بمأثور الخطاب لدليمي : (255/5) .

الله عليـه وسـلم ) فەرمـوويەتی : ( الله تعـالی هەمـوو شـەوێك دادەبەزێـت بـۆ ئاسمانی دونیا کاتێك کە سێیەکی کۆتایی شەو دەمینێت ، دەفەرمووێت : هیچ بەنـدەیەك لە بەنـدەکانم هەیە لـێم بپـاڕێتەوە تـاوەکو وەڵامـی بـدەمەوە ؟ هـیچ کەسـێك هەیە سـتەمی لەنەفسـی خـۆی کردبێـت لـێم بپـاڕێتەوە تـاوەکو لێـی خۆشـببم ؟ هـیچ کەسـێك هەیە ڕزقـی گیرابێـت لـێم بپـاڕێتەوە تـاوەکو ڕزقـی پـێ ببەخشـم ؟ هـیچ کەسێك هەیە ستەمی لێکرابێـت لـێم بپاڕێتەوە تـاوەکو سـەری بخەم ؟ هیچ کەسێك هەیە ستەمی لەنەفسی خۆی کردبێت لێم بپاڕێتەوە تاوەکو لەسـەری لابـبەم ؟ بەو شـێوەیە بەردەوام دەبێـت تـاوەکو بەیـانی دەبێـتەوە و بەرزدەبێتەوە بۆ سەر کورسی خۆی )[40] .

وە لە ڕێگـای هشـام الدسـتوائي ئـەبو الزبیـر لە جابـرەوە کەوا پێغەمبـەری الله (صلی الله علیە وسلم ) فەرمـوویەتی : ( لە کۆتـایی کـاتی ڕۆژی عەرەفە الله تعـالی تێیدا دادەبەزێت بۆ ئاسمانی دونیا و شانازی دەکات بەخەڵکی سەر زەوی بەسەر بەخەڵکی ئاسمانەوە ، وە دەفەرمووێت : ( سەیری بەندەکانم بکەن بە قژی بڵاو و تـۆزاوی و گەرمەوە ، لەهەمـوو ڕێگـایەکی دوور و درێـژەوە هـاتوون ، داوا و تکـای ڕەحمەتم دەکەن و سزای منیشیان نەبینیوە ، هیچ ڕۆژێك نییە بەندە بەو ڕادەیە ڕزگاری ببێت لە ئاگر بە قەدەر ڕۆژی عەرەفە )[41] .

---

(40) لە سەرەتای فەرموودەکەوە تا :" تاوەکو لێی خۆشببم " ئیمام احمد هێناویەتیەوە لە مەسنەدەکەیدا (16745) ، وە دارمي لە سونەنەکەیدا (929/2) بەژمارە (1521) ، وە آجري لە الشريعەدا (3/1142) بە ژمارە (715) ، وە ابن ابي عاصم لە سونەتدا (1/220) بەژمارە (503) ، هەموویان لە ڕێگای نافع بن جبير بن مطعم لە باوكيەوە ، بەبێ لەفزی: " لە سێیەکی کۆتایی شەودا " .

(41) صحيح بن خزيمة (2840) وصحيح ابن حبان (3853) ومسند أبي يعلى (2090) وە دارمي لە الرد على الجهمية بە ژمارە (137) وە إبن بطة لە الإبانة الكبرى بەژمارە (178-177) وە لالكائي لە شرح أصول أعتقاد بە ژمارە (751) و (768) وە بغوي لە شرح السنة(7/159) بە ژمارە (1931) .

وه هشام الدستوائي له يحيى ى كوڕى أبي كثيرەوه له هلال ى كوڕى ميمونەوه له عطاء ى كوڕى يسار له رفاعة الجهنيەوه باسى كرد كه پێغەمبەرى الله ( صلى الله عليه وسلم ) فەرموويەتى : ( ئەو كاتەى كه سێيەكى شەو ياخود نيوەى تێپەڕى الله تعالى بۆ ئاسمانى دونيا دادەبەزێت و دەفەرمووێت : جگە لەبەندەكانم پرسيار لەكەس ناكەم ، كێ داواى لێخۆشبوونم لێدەكات تاوەكو لێى خۆشببم ؟ كێ لێمدەپاڕێتەوه تاوەكو وەڵامى بدەمەوه ؟ كێ داوام لێدەكات تاوەكو پێى ببەخشم ؟ تا ئەوكاتەى كەوا بەيانى بەسەردا دێت )[42] .

ئەبو محمد المخلدي هەواڵى پێداين : ئەبو العباس السراج هەواڵى پێ داين : محمدى كوڕى يحيى بۆى باسكردين : عبيد الله ى كوڕى موسى بۆى باسكردين له إسرائيلەوه له ئەبو إسحاقەوه له ئەبو مسلم الأغرەوه فەرمووى : شايەدى دەدەم بۆ ئەبو سعيد و ئەبو هريرة كه شايەديان داوه بۆ پێغەمبەرى الله ( صلى الله عليه وسلم ) و منيش شايەديان بۆ دەدەم كه گوێيان له پێغەمبەرى الله (صلى الله عليه وسلم) بووه فەرموويەتى : ( الله تعالى چاوەڕێ دەكات تاوەك ئەوكاتەى كه سێيەكى شەو تێدەپەڕێت ئينجا دادەبەزێت بۆ ئاسمانى دونيا ، وه دەفەرمووێت هيچ تاوانبارێك هەيه ؟ هيچ داواكەرێكى لێخۆشبوون هەيه ؟ هيچ داواكەرێك هەيه ؟ هيچ دوعاكەرێك هەيه ؟ تاوەكو ڕۆژ هەڵدێت )[43] .

ئەبو محمد المخلدي پێى ڕاگەياندين : ئەبو العباس الثقفي پێى ڕاگەياندين : حسن ى كوڕى الصباح پێى ڕاگەياندين : شبابة ى كوڕى ثوار پێى ڕاگەياندين له يونسى كوڕى ئەبو إسحاقەوه له ئەبو مسلم الأغرەوه فەرموويەتى : شايەدى دەدەم بۆ ئەبو سعيد و ئەبو هريرة كه فەرموويانه : پێغەمبەرى الله (صلى الله عليه

(42) صحيح مسلم : (758) .

(43) صحيحه : شرح أصول أعتقاد أهل السنة والجماعة: (754) وه صحيحي مسلم : (758) بەبێ لەفزى : " تاوەك بەيانى دادێت " .

وسلم ) فەرموويەتی : ( الله تعالی چاوەڕێ دەکات تاوەك ئەوکاتەی کە سێیەکی شەو تێدەپەڕێت ئنجا دادەبەزێت بۆ ئەو ئاسمانە ، ئینجا فەرمانی کرد بەکردنەوەی دەرگاکانی ئاسمان و کرانەوە و فەرمووی : هیچ داواکەرێك هەیە تاوەکو پێی ببەخشم ؟ هیچ دوعاکەرێك هەیە تاوەکو وەڵامی بدەمەوە ؟ هیچ داواکەرێکی لێخۆشبوون هەیە تاوەکو لێی خۆشببم ؟ هیچ کەسێك هەیە نارەحەتی لەسەر بێت تاوەکو لەسەری لاببەم ؟ هیچ هانابەرێك هەیە تاوەکو بەهانایەوە بێم ؟ لە شوێنێ خۆیدا دەمێنێتەوە تاوەکو بەیانی هەڵدێت لەهەموو شەوێکی دونیادا )[44] .

ئەبو محمد المخلدي هەواڵی پێداین : ئەبو العباس الثقفي پێی ڕاگەیاندین : مجاهدی کوڕی موسی و الفضل ـی کوڕی سهل بۆیان باسکردین و فەرموویان : یزیدی کوڕی هارون بۆی باسکردین : سهل بۆی باسکردین لە ئەبو إسحاقەوە لە الأغرەوە کە شایەدیان داوە بۆ ئەبو هریرة و ئەبو سعید کە شایەدیان داوە بۆ پێغەمبەری الله ( صلی الله علیه وسلم ) کە فەرموویەتی : ( کاتێك کە سێیەکی شەوە الله تعالی دادەبەزێت بۆ ئاسمانی دونیا و دەفەرمووێت : هیچ داواکەرێکی لێخۆشبوون هەیە تاوەکو لێخۆشببێت ؟ هیچ داواکەرێك هەیە تاوەکو داوایەکەی پێ ببەخشرێت ؟ هیچ تەوبەکارێك هەیە تاوەك و تەوبەی لیوەربگیرێت )[45] .

ئەبو منصوری کوڕی حماد بۆی باس کردین : ئەبو إسماعیلی کوڕی ئەبو الظمأ لە بەغداد بۆی باسکردین : ئەبو منصور الرمادي بۆی باسکردین : عبدالرزاق بۆی باسکردین : معمر پێی ڕاگەیاندین لە سهیل ـی کوڕی ئەبو صالحەوە لە باوکیەوە لە ئەبو هریرەوە فەرموویەتی : پێغەمبەری الله ( صلی الله علیه وسلم )

(44) دارقطني ڕیوایەتی کردووە لە کتێبی النزول بەلەفزی خۆی ژمارە (55) وە ئیمام احمد لە مسندەکەیدا : (11893) وە بغوي لە شرح السنة : (64/4) ، بەبێ لەفزی:" ئینجا فەرمانی کرد بە کرانەوەی دەرگاکانی ئاسمان" .

(45) السنن الکبری للنسائي : (9/180)، والشریعة للآجري : (1135/3) بەژمارە (706) ، الدعاء للطبراني : (146) .

فەرمـوويەتی : ( الله تعـالی هەمـوو شـەوێك دادەبەزێـت بـۆ ئاسـمانی دونیـا ، دەفەرمووێت : من پاشـام من پاشام ، سێ جار ، کێ داوام لێدەکات تاوەکو پێی ببەخشم ؟ کێ لێمدەپاڕێتەوە تاوەکو وەڵامی بدەمەوە ؟ کێ داوای لێخۆشبوونم لێدەکات تـاوەکو لێی خۆشـببم ؟ بەو شـێوەیە بەردەوام دەبێـت تـا ئەوکـاتەی کە بەیانی دادێت )[46] .

## ( وتەی ئەبو حنیفة لەسەر فەرموودەی دابەزینی الله تعالی )

گـوێم لە أسـتاذ أبـا منصـور لەسـەر باسـی ئەو فەرمـوودەی کە بۆمـانی بـاس کـرد ، فەرمووی : پرسیارکرا لە ئـەبو حنیفة دەربارەی ئەو دابەزیـن ؟ فەرمووی : ( بەبێ چۆن و چۆنیەتی دادەبەزێت )[47] .

وە هەنـــدێکیان فەرموویـــانە : ( بەشـــێوەیەك دادەبەزێـــت کەوا شایســـتەی پەروەردگارییەتی خۆیەتی بەبێ چۆنیەتی ، بەبێ ئەوەی کەوا دابەزینەکەی وەك دابەزینـی دروسـتکراوەکان بێـت بە چۆڵبـوونی شـوێنەکەی ، چـونکە الله تعـالی دوورە و بەریە لەوەی سـیفاتەکانی وەك سـیفاتی دروسـتکراوەکانی بێـت ، وەك چۆن دووربووە و بەریبووە لەوەی کە زاتی وەك زاتی دروستکراوەکانی بێت ، جا هـاتنی الله تعـالی و دابەزینی لەسـەر ئەو شێوازە دەبێت کە شایستەی خۆیەتی ، بەبێ لێکچواندن و چۆنیەتی ) .

## ( وتەی ئیبن خزیمة لەسەر فەرموودەی دابەزینی الله تعالی )

وە ئەبوبکر محمدی کوڕی إسحاقی کوڕی خزیمة لە کتێبی ( التوحید ) دا وە گوێم لە هەڵگری کتێبەکەی ئەبو طاهر بوو کە ئیبن خزیمة فەرموویەتی : ( بابی باسی هەواڵە جێگیـرە بەسـەنەدەکان زانایـانی حیجـاز و عێـراق ڕیوایەتیـان کـردووە لە

(46) صحيح مسلم : (758) .

(47) بەهەمان شێوە لە الأسماء والصفات للبيهقي : (200/2) .

دابەزینی الله تعالی لەهەموو شەویکدا بۆ ئاسمانی دونیا ، بەبێ وەسفکردنی چۆنیەتی دابەزینەکە ، جێگیر کردنی سیفەتەکە شایەدی دەدەین شایەدیەك کە بەزوبان گوتراوە بە دڵ بەڕاست دانراوە لەسەر ئەو هەواڵانەی باسی دابەزینی الله تعالی ، بەبێ ئەوەی وەسفی چۆنیەتیەکەی بکەین ، چونکە پێغەمبەرەکەمان ( صلی الله علیه وسلم ) باسی چۆنیەتی دابەزینی خواکەمانی بۆ ئاسمانی دونیا نەکردووە ، پێمانی ڕاگەیاندووە کە دادەبەزێت ، وە الله تعالی ڕوونکردنەوەی خستۆتە ئەستۆی پێغەمبەرەکەی ( صلی الله علیه وسلم ) لەو شتانەی کە موسڵمانان پێویستیانە لە دینەکەیاندا ، ئێمەش دەیلێین وە ئەو هەواڵانە بەڕاست دادەنێین لەوانەش هەواڵی دابەزینە ، بەبێ ئەوەی پەیوەست کرابین بە وەسفکردنی چۆنیەتیەکەی ، چونکە پێغەمبەری الله ( صلی الله علیه وسلم ) وەسفی چۆنیەتی دابەزینەکەی نەکردووە )[48] .

## ( هەواڵی دابەزینی الله تعالی ڕۆژی عەرەفەدا )

حاکم ئەبو عبد الله الحافظ پێی ڕاگەیاندین : ئەبو محمد الصیدلاني بۆی باسکردین : علي کوڕی الحسین ـ کوڕی الجنید بۆی باس کردین : أحمدی کوڕی صالح المصري بۆی باسکردین : ئیبن وهب بۆی باسکردین : مخرمة ـ کوڕی بکیر پێی ڕاگەیاندین لە باوکیەوە ، وە حاکم هەواڵی پێداین محمدی کوڕی یعقوب الأصم بۆی باسکردین : إبراهیمی کوڕی المنذر بۆی باسکردین : ئیبن وهب بۆی باس کردین لە مخرمة ـ کوڕی بکیرەوە لە باوکیەوە فەرموویەتی : گوێم لە محمدی کوڕی المنکدر بوو بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە گوێی لە أم سلمة هاوسەری پێغەمبەری الله ( صلی الله علیه وسلم ) بووە فەرموویەتی : ( چاکترین

(48) التوحید وأثبات صفات الرب : (241) .

ڕۆژ ئەو ڕۆژەیە کە الله تعالی تێیدا دادەبەزێت بۆ ئاسمانی دونیا ) گوتیان : چ ڕۆژێك ؟ فەرمووی : ڕۆژی عەرەفە )[49] .

## ( هەواڵی دابەزینی الله تعالی لە شەوی نیوەی مانگی شەعبان )

عائشە الله لێی ڕازی بێت گێڕاویەتیەوە لە پێغەمبەری الله وە ( صلی الله علیه وسلم ) فەرموویەتی : ( الله تعالی لە نیوەی مانگی شەعبان دادەبەزێت بۆ ئاسمانی دونیا لە شەوەوە تاوەکو کۆتایی ڕۆژی بەیانی ، هەرکەسێك بەڕادەی موی بزنی بني کلب لە ئاگر ڕزگار دەبێت ، وە حەجەکان دەنوسرێت وە ڕزق و ڕۆژی سونەکان دادەبەزێت ، هیچ کەسیك نامێنێت ئیللا لێخۆشبوون دەیگرێتەوە تەنها کەسێکی هاوبەش بڕیاردەر یاخود کەسێك سیلەی ڕەحمی بڕیبێت یاخود سەرپێچی کارێك یاخود کەسێك کە پەیوەندی موسلمانیەتی پچڕاندبێت )[50] .

## ( هەواڵی دابەزینی الله تعالی لە ڕێگای ڕفاعەی کوڕی عرابەوە )

ئەبو طاهری کوڕی خزیمە پێی ڕاگەیاندین : جدي بۆی باسکردین : حەسەنی کوڕی محمد زعفراني بۆی باسکردین : ئیسماعیلی کوڕت علیه بۆی باسکردین لە هشام دستوائیەوە ، ئیمام فەرمووی : وە زعفراني بۆی باسکردین : عبد الله ی کوڕی بکر السهمي بۆی باسکردین : هشام دستوائي بۆی باسکردین ، وە زعفراني بۆی باسکردین : یزیدی کوڕی هاروون بۆی باسکردین : هشام دستوائي پێی ڕاگەیاندین ، وە محمدی کوڕی عبد الله ی کوڕی میمون بۆی باسکردین : ولید بۆی باسکردین لە ئەوزاعیەوە هەموویان لەیحیی ی کوڕی ئەبو کثیرەوە لە عطائی کوڕی یسارەوە : ڕفاعەی کوڕی عرابە جهني بۆی باسکردم . وە ئیمام فەرمووی : ئەبو هشامی کوڕی زیاد کوڕی ئەیوب بۆی باسکردین : مبشری کوڕی ئیسماعیل حلبي بۆی باسکردین لەئەوزاعیەوە : یحیی ی کوڕی ئەبو کثیر بۆی باسکردم :

---

(49) حەسەنە : النزول للدارقطني : (95-96) ، وشرح أصول أعتقاد أهل السنة والجماعة للالكائي بە ژمارە (768) .

(50) زۆر لاوازە لاوازە : ئیمام احمد ڕیوایەتی کردووە لە مەسنەدەکەیدا: (26018) وترمذي لە سونەنەکەیدا: (739) .

هیلالی کوڕی ئەبو میمونە بۆی باسکردم لە عطائی کوڕی یسارەوە : رفاعەی کوڕی عرابە جهني بۆی باسکردین فەرمووی : لەگەڵ پێغەمبەری الله ( صلی الله علیه وسلم ) گەڕاینەوە بۆ مەککەدا داوای ڕووخسەتیان لە پێغەمبەری الله کرد ( صلی الله علیه وسلم ) و ئەویش ڕووخسەتی پێدان ، ئینجا پێغەمبەری الله ( صلی الله علیه وسلم ) فەرمووی : ( ئایا هۆکاری ئازار و مەینەتی ئەو دارەی کە لەپێغەمبەری الله وە نزیکە چییە زیاتر ڕقتان لێدەبێتەوە لەوەی تر ، ئینجا دەست بەدەست خەڵکەکە دەستیان کرد بە گریان ، فەرمووی : ئەبوبەکری صدیق دەفەرمووێت : ئەوەی کەوا داوای ڕوخسەتت لێدەکات نەفام و نەزانە ، ئینجا پێغەمبەری الله (صلی الله علیه وسلم ) هەستایەوە و سوپاس و ستایشی الله ـی کرد و سوێندی خوارد و فەرمووی : سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە ، لای الله تعالی شایەدی دەدەم کە هەریەکێك لە ئێوە بڕوا بە الله و ڕۆژی دوایی بێنێت و ئینجا ڕێگاکە بگرێتەبەر ئیللا بەرەو بەهەشتی دەبات ، وە خواکەم بەڵێنی پێداوم کە حەفتا هەزار کەس لە ئوممەتەکەم بەبێ لێپێچینەوە و سزا دەچنە بەهەشتەوە ، وە ئومێدی ئەوە دەکەم کە ئیمان بهێنن و بچنە ناویەوە ، و ئەوەشی چاکبێت لە هاوسەرانیان و نەوەکانیان ئەوا جێگاتان لە بەهەشتە ، ئینجا فەرمووی : کاتێك کە بەشێکی - یاخود فەرمووی : سێیەکی شەو - تێدەپەڕێت الله تعالی دادەبەزێت بۆ ئاسمانی دونیا ، ئینجا دەفەرمووێت : جگە لەبەندەکانم پرسیار لە کەس ناکەم ، کێ داوام لێدەکات تاوەکو پێی ببەخشم ؟ کێ لێمدەپاڕێتەوە تاوەکو وەڵامی بدەمەوە ؟ کێ داوای لێخۆشبوونم لێدەکات تاوەکو لێی خۆشببم ؟ تا ئەوکاتەی کە بەیانی بەسەردا دێت [51] ، ئەوە لەفزی فەرموودەکەی وەلیدە .

(51) صحیحه : دارقطني هێناویتیەوە له الرؤية : (106-102) .

## ( وتەی ئەهلی سوننە دەربارەی هەواڵی دابەزینی الله تعالی )

گوتم : کاتێك کە هەواڵی دابەزینـی الله تعالی بەدروستی هاتـووە لە پێغەمبەرەوە ( صـلی الله علیـه وسـلم ) ئەهلـی سـوننە دانیـان پێنـاوە و قبوڵیـان کـردووە ، وە دابەزینـی الله یـان جێگیـر کـردووە لەسـەر ئەوەی کە پێغەمـبەری الله ( صـلی الله علیـه وسـلم ) فەرمـوویەتی ، وە بـڕوای چوانـدنیان بە دابەزینـی دروسـتکراوەکان نەبـووە ، وە زانسـتیان پـێ هەبـووە و لێکۆڵینەوەیـان کـرد و بڕوایـان وابـووە کە سـیفاتەکانی الله تعـالی بە سـیفاتەکانی دروسـتکراوەکان ناچێت ، وەك چۆن زاتی الله بە زاتـی دروسـتکراوەکان ناچێـت ، پـاك و بـێگەردی و مەزنـی بـۆ الله تعـالی لەسـەر ئەوەی لێکچـوان و پەکـخەران دەیڵـێن ، وە نەفرەتـی زۆری الله تعـالی لەسەریان .

## ( جێگیرکردنی سیفەتی هاتن ( المجيء ) )

وە بۆ ئەبو عبد الله کوڕی ئەبو حفص بوخاریم خوێندەوە ، کە شێخی بوخاری بوو لەوکـاتەدا ، وە ئەبـو حفـص لەگەورەیـانی هـاوەڵانی محمـدی کـوڕی حەسـەن شەیبانی بوو ، ئەبو عبد الله فەرمووی - مەبەستم کوڕی ئەبو حفصە - : گوێم لە عبـد الله ی کـوڕی عوسـمان بـوو کە ئەویـش عەبـدان شـێخی مـروەیە دەیفەرمـوو : گوێم لە محمـدی کـوڕی حەسـەن شـەیبانی بـوو دەیفەرمـوو : حمـادی کـوڕی ئەبو حنیفە فەرمووی : بەو کەسانەمان گوت : ئایا وتەی الله تعالی تان بینیوە : ( وَجَاءَ رَبُّكَ وَالْمَلَكُ صَفًّا صَفًّا )[52] ؟ گوتیـان : مەلائیکەتەکـان پـۆڵ پـۆڵ دێـن ، بەڵام سـەبارەت بە پەروەردگـار ئەوا ئێمە نـازانین مانـای ئەوە چییە ، وە نـازانین هـاتنی چـۆنە ، ئـێمەش پێمـان گـوتن : ئـێمە پێمـان نەگـوتن کە چـۆنیەتی هـاتنی بزانن ، بەڵام داواتـان لێدەکەین کە بـڕوا بهێنـین بە هـاتنی ، ئایـا ئەو کەسـەت بینیـوە کە نکۆڵی لەوە بکات کە پاشا پۆل پۆل دێت ئایا حوکمی چییە لای ئێوە ؟ گوتیان :

(52) سورة الفجر : 22 .

كافرێكی بەدرۆخەرەوەیە ، گوتمان : بەهەمان شێوە ئەوەی نكۆڵی بكات لەوەی الله تعالی دێت ئەوا كافرێكی بەدرۆخەرەوەیە .
وە ئەبو عبد الله كوڕی ئەبو حفص بوخاري لە كتێبەكەیدا [53] فەرموویەتی : ئیبراهیم باسی كرد لە ئەشعەثەوە فەرمووی : گوێم لە فوضەیلی كوڕی عیاض بوو دەیفەرموو : ( ئەگەر جەهمیەك پێتی گوت : من بڕوا ناهێنم بەخوایەك كە لە شوێنی خۆی لابچێت ، تۆش بلێ : من بڕوا بە خوایەك دەهێنم كە هەرشتێك ویستی لەسەر بێت ئەنجامی دەدات ) .

## ( هەڵوێستی سەلەف بەرامبەر كەسانی ڕەخنەگر لە دەقەكان )

وە یزیدی كوڕی هارون لە دانیشتنەكەیدا فەرموودەی ئیسماعیلی كوڕی ئەبو خالد ، لە قەیسی كوڕی ئەبو حازمەوە ، لە جریری كوڕی عبد الله وە دەربارەی بینین ( بینینی ئیمانداران بۆ الله ) وە ووتەی پێغەمبەری الله ( صلی الله علیه وسلم ) : ( ئێوە سەیری پەروەردگارتان دەكەن وەك چۆن سەیری مانگ دەكەن لە شەوی بەدردا )[54] ، پیاویك لە دانیشتەكەیدا پێی گوت : ئەی باوكی خالد ، مانای ئەو فەرموودەیە چییە ؟ ئیمام توڕەبوو ، وە فەرمووی : چەند بە صبیغ دەچیت ، وە چەند پێویستت بەوەیە كە وەك ئەوت لێبكرێت ، وەیل بۆت ، جا كێ دەزانێت ئەوە چۆنە ؟ بۆ كێ دروستە كە سنوری ئەو قسەیە تێپەڕێنێت كە لە فەرموودەكەدا هاتووە یاخود قسەیەك بكات كە لەخۆیەوە بێت و لە كەمی خۆیەوە بێت و دینەكەی بەكەم وەربگرێت ؟ ئەگەر فەرموودەتان لە پێغەمبەری الله ( صلی الله علیه وسلم ) وە گوێ لێ بوو ئەوا شوێنی بكەون و داهێنانی تێدا مەكەن ، ئەگەر ئێوە شوێنی كەوتن و ئەوەندە لەسەری نەچوون ئەوا سەلامەت دەبن ، ئەگەر واش نەكەن ئەوا بە هیلاك دەچن .

---

(53) خلق أفعال العباد : (61) .
(54) هەریەك لە النسائي لە سنن الكبری : (10/271) ، و طبراني لە المعجم الكبیر : (2/310) ، و دارقطني لە كتێبی الرؤیة : (13) بەو لەفزە هێناویانەتەوە .

وە ڕووداوی صبیغ کەوا یزیدی کوڕی هارون بە پرسیارکەرەکەی گوت : چەند بە صبیغ دەچیت ، وە چەند پێویستت بەوەیە کە وەك ئەوت لێبکرێت ، ئەو ڕووداوەیە کە یحیی ی کوڕی سعید لە سعیدی کوڕی موسەیبەوە ڕیوایەتی کردووە کە صبیغی تمیمي هات بۆ لای ئەمیری بڕواداران عومەری کوڕی خەطاب ڕەزای الله لەسەری بێت گوتی : ئەی ئەمیری بڕواداران ، دەربارەی ئەو ئایەتە قسەم بۆ بکە : ( وَالذَّارِيَاتِ ذَرْوًا )[55] ، فەرمووی : ئەوە مەبەستی پێ لە با و تۆزە ، وە ئەگەر گوێم لە پێغەمبەری الله نەبوایە وای بفەرمووایە ئەوا وام نەدەگوت ، گوتی : جا دەربارەی ئایەتی : ( فَالْحَامِلَاتِ وِقْرًا )[56] قسەم بۆ بکە ، فەرمووی : ئەوە مەبەست پێی لە هەورە ، وە ئەگەر گوێم لە پێغەمبەری الله نەبوایە وای بفەرمووایە ئەوا وام نەدەگوت ، گوتی : دەربارەی ئایەتی : ( فَالْمُقَسِّمَاتِ أَمْرًا )[57] قسەم بۆ بکە ، فەرمووی : مەبەست پێی لە مەلائیکەتەکانە ، وە ئەگەر گوێم لە پێغەمبەری الله نەبوایە وای بفەرمووایە ئەوا وام نەدەگوت ، گوتی : دەربارەی ئایەتی : ( فَالْجَارِيَاتِ يُسْرًا )[58] قسەم بۆ بکە ، فەرمووی : کەشتیەکانن ، وە ئەگەر گوێم لە پێغەمبەری الله نەبوایە وای بفەرمووایە ئەوا وام نەدەگوت ، ئینجا فەرمووی : عومەر فەرمانی کرد کە لێی بدرێت بە سەد جەلدە ، ئینجا لە ماڵێك هێشتیەوە تا ئەوکاتەی کە هەستی کرد کە ئازارەکانی نەماوە ئینجا بانگی کرد ، ئینجا سەد جەلدەی تریٚ لێدا ، ئینجا فەرمانی کرد بەوەی لە کۆلەکەی ڕەقی سەر پشتی حوشتر سوار بکرێت ، وە نامەی نارد بۆ ئەبو موسی ئەشعەری کە دانیشتنی لەگەڵ خەڵکیدا لیٚ حەرام بکرێت ، بەو شێوەیە مایەوە تاوەکو ئەبو موسی ئەشعەری هات ، صبیغ سوێندی زۆری خوارد کە هیچ شتێك لەمێشکی نەماوە لەو شتانەی کە پێشتر لەبیر و هۆشی بوون ، جا نامەی نارد بۆ عومەر

(55) سورة الذاريات : 1 .

(56) سورة الذاريات : 2 .

(57) سورة الذاريات : 4 .

(58) سورة الذاريات : 3 .

تاوەکو هەواڵی پێ بدات ، عومەر هەواڵی بۆ ناردەوە و فەرمووی : لەڕاستگۆیی هیچی تری لێ نابینرێت ، دانیشتن و قسە کرد لەنێوان ئەو و خەڵکدا بکەوە [59] .

وە حمادی کوڕی زید ڕیوایەتی کردووە لە قطنی کوڕی کەعبەوە : گوێم لە پیاوێکی بنەماڵەی عجل بوو پێی دەگوترا : فلان - خالیدی کوڕی زرعە - لەباوکیەوە باسی دەکرد فەرمووی : صبیغی کوڕی عسلم بینی لە بەصرا وەك وابێت وشترێکی نەخۆشە ، دێت بۆ کۆڕەکان هەرکاتێك لای کۆمەڵێك دانیشتبوایە نەیان ئەناسی ، خەڵکی کۆمەڵەیەکی تر بانگیان دەکرد : ئەمیری بڕواداران فەرمانی کردووە پێتان قسەی لەگەڵ نەکەن [60] .

بەهەمان شێوە حمادی کوڕی زەید ڕیوایەتی کردووە لە یەزیدی کوڕی ئەبو حازمەوە لە سلیمانی کوڕی یەسارەوە کە پیاوێك لە بنەماڵەی تمیم پێی دەگوترا صبیغ هاتە مەدینە ، هەندێك کتێبی لابوو وای لێهات پرسیاری دەربارەی ئەو ئایەتانە دەکرد کە مانای فراوان و جۆراوجۆر دەبەخشن ( متشابە ) ، ئەو هەواڵەش گەیشت بە عومەر ، وە نێردرا بۆ لای ، وە عومەر گەلای قامیشی دارخورمای بۆ ئامادە کردبوو ، کاتێك کە هاتە لای دانیشت ، عومەر پێی گوت : تۆ کێی ؟ گوتی : من صبیغ بەندەی خوام ، فەرمووی : منیش عومەر بەندەی خوام ، ئینجا لێی نزیك بوویەوە و بەو گەڵا قامیشە لێی دەدا ، بەردەوام لێی دەدا تاوەکو لەهۆش خۆی برد ، وای لێهات خوێن بە ڕووخساری دا دەهاتە خوارەوە ، گوتی : بەسە ئەی ئەمیری بڕواداران ، واللە ئەوشتەی کەوا لەمێشکمدا بوو ڕۆشت نەما [61] .

---

(59) سنن الدارمي : (150) ، و البدع لإبن وضاح : (212-211) وە مەسنەدی البزار : (299) ، والشريعة للآجري : (5/2556) ، و الإبانة لإبن بطة : (329) و جگە لەوانەش .

(60) شرح أصول أعتقاد أهل السنة والجماعة للالكائي : (1140) ، والحجة في بيان المحجة : (1/194-195) .

(61) شرح أصول أعتقاد أهل السنة والجماعة للالكائي : (1138) ، والحجة في بيان المحجة : (1/194) .

## ( ئاگاداركردنەوەی مالیكی كوڕی أنس بەرامبەر بەكۆمەڵەی بیدعەچیان )

ئەبو عبد الرحمن محمدی كوڕی حسێن كوڕی موسى سلمي پێی ڕاگەیاندین : محمدی كوڕی محمود فقیه مروزي پێی ڕاگەیاندین : محمدی كوڕی عمیر رازي بۆی باسكردین : ئەبو زكریا یحیى ــ ی كوڕی أیوب علاف تجیبي لە مصر بۆی باس كردین : یونسی كوڕی عبد الأعلى بۆی باسكردین : ئەشهەبی كوڕی عبد العزیز بۆی باسكردین فەرمووی : گوێم لە مالیكی كوڕی ئەنەس بوو دەیفەرموو : دووركەونەوە لە بیدعە ، گوترا : ئەی باوكی عبداللە ، بیدعە چییە ؟ فەرمووی : كۆمەڵەی بیدعەچیان ئەوانەن كە قسە دەكەن لەسەر ناو و سیفاتەكانی اللە و قسەكردنی و زانستی و توانینی ، لەوەندە بێدەنگ نابن كە هاوەڵان و تابعین لێی بێدەنگ بوون [62] .

ئەبو حسێن أحمدی كوڕی محمدی كوڕی عمر زاهد خفاف پێی راگەیاندین : ئەبو نعیم عبد الملك ــ ی كوڕی محمدی كوڕی عودەی پێی ڕاگەیاندین : ڕەبیعی كوڕی سلێمان بۆی باسكردین فەرمووی : گوێم لە شافعی بوو دەیفەرموو : ئەگەر اللە تعالى بەندە توشی هەموو تاوانێك بكات جگە لە شیرك ، خۆشەویستترە لام لەوەی توشی شتێك لە هەواو ئارەزووی بكات [63] .

## ( ئامۆژگاری عومەری كوڕی عبدالعزیز لەسەر پەیوەست بوون بەدین )

ئەبو طاهر محمدی كوڕی فضل پێی ڕاگەیاندین : ئەبو عمرو حیري بۆی باس كردین : باوكی ئەزهەر بۆی باسكردین : قبیصة بۆی باسكردین : سفیان لە جەعفەری كوڕی برقانەوە بۆی باسكردین فەرمووی : پیاوێك پرسیاری لە عومەری

---

(62) شرح السنة للبغوي : (1/217) ، أحادیث في ذم الكلام لاپەڕە : (83) الحجة في بیان المحجة لأبي قاسم الأصبهاني : (1/114) .

(63) الإبانة الكبرى لإبن بطة : (1881) ، شرح أصول أعتقاد أهل السنة والجماعة للالكائي : (1013) ، حلیة الأولیاء لإبن نعیم : (9/111) ، الأعتقاد للبیهقي لاپەڕە : (239) ، جامع بیان العلم وفضله : (2/939) به ژمارە : (1788) أحادیث في ذم الكلام لاپەڕە : (78) .

كوڕی عبدالعزيز كرد سەبارەت بە شتێك لە هەواو ئارەزوو ، فەرمووی : پەیوەستبە بەدینی دەشتەكیەكە و منداڵەكە لە كتێبدا ، جگە لەوە مەیلت بۆ لای هیچی تر نەبێت [64] .

## ( سوفیانی كوڕی عویینە فەرمانی كردووە بە بێدەنگ بوون دەربارەی چۆنیەتی سیفەتەكانی الله )

ئەبو عبد الله حافظ پێی ڕاگەیاندین : محمەدی كوڕی یزید بۆی باسكردین فەرمووی : گوێم لە ئەبو یحیی قزاز بوو دەیفەرموو : گوێم لە عباسی كوڕی حمزە بوو دەیفەرموو : گوێم لە أحمەدی كوڕی ئەبو حواري بوو دەیفەرموو : گوێم لە سوفیانی كوڕی عویینە بوو دەیفەرموو : هەموو ئەو وەسفانەی كە الله وەسفی خۆی پێكردووە لە كتێبەكەیدا تەفسیر كردن و خوێندنەوەی و بێدەنگ بوون لەسەری [65] .

ئەنو حسێن خفاف بۆی باسكردین : ئەبو عباس محمەدی كوڕی ئیسحاق سراج بۆی باسكردین : هەیثەمی كوڕی خارجە بۆی باسكردین فەرمووی : گوێم لە وەلیدی كوڕی موسلیم بوو دەیفەرموو : پرسیارم كرد لە ئەوزاعی و سوفیان و مالیكی كوڕی ئەنەس دەربارەی ئەو فەرموودانەی سیفات و بینین ، فەرمووی : (بەڕێی بكەن وەك چۆن هاتووە بەبێ چۆن و چۆنیەتی ) [66] .

---

(64) سنن الدارمي : (314)، طبقات الكبرى لإبن سعد : (5/290) ، شرح أصول أعتقاد أهل السنة والجماعة للالكائي : (250)، الشريعة للآجري (2050)، الإبانة الكبرى لإبن بطة (194)، شعب الإيمان للبيهقي : (1/181)، شرح السنة للبغوي : (1/217) .

(65) الأعتقاد للبيهقي : (118) والأسماء والصفات : (2/185) به ژماره : (725) .

(66) الإبانة الكبرى لإبن بطة : (7/241) بەژمارە : (183) ، شرح أصول أعتقاد أهل السنة والجماعة للالكائي : (930)، الشريعة للآجري : (3/1146) بەژمارە : (720)، الأعتقاد للبيهقي (118)، جامع بيان العلم وفضله : (2/943)، شرح السنة للبغوي : (1/171) .

## ( پابەندبوون بە تەسلیم بوون بۆ فەرمان ڕوونکردنەوەی الله تعالی و پەیامی پێغەمبەرەکەی (صلی الله علیه وسلم) )

ئیمام زوهری ئیمامی زانایان لەسەردەمی خۆی و چاوی زانایانی ئومەت لەو کاتدا ، فەرموویەتی : ( لەسەر الله ڕوونکردنەوەیە ، وە لەسەر پێغەمبەریش گەیاندنە ، وە لەسەر ئێمەش تەسلیم بوونە [67] .

وە لەهەندێك سەلەفەوە هاتووە : ( قاچەکانی ئیسلام جێگیر نابێت تەنیا لەسەر بڕبڕەی تەسلیم بوون نەبێت ) .

## ( تێکۆشان بۆ زیندووکردنەوەی سوننەت )

ئەبو طاهر کوڕی خزیمە پێی ڕاگەیاندین : جدی ئیمام بۆی باسکردین : أحمدی کوڕی نصر بۆی باسکردین : ئەبو یعقوب حنيني بۆی باسکردین : کثیر ـی کوڕی عبد الله مزني بـۆی باس کردین لەباوکیـەوە لە باپیریـەوە فەرمووی : پێغەمبەری الله ( صلی الله علیه وسلم ) فەرموویەتی : ( ئەو دینە بە نـامۆیی سـەری هەڵدا ، بەنـامۆییش سـەرهەڵدەداتەوە ، سـەرفرازی بـۆ نامۆکـان ) [68] گـوترا : ئەی پێغەمبەری الله نامۆکان کێن ؟ فەرمووی : ( ئەوانەی کە لەدوای من سونەتەکەم زیندوو دەکەنەوە و بەندەکانی الله فێری ئەو سونەتانە دەکەن ) .

ئەبو عبد الله حافظ پێی ڕاگەیاندین فەرمووی : گوێم لە ئەبو حەسەن کارزي بوو دەیفەرموو : گوێم لە علی کوڕی عبدالعزیز بوو دەیفەرموو : گوێم لە ئەبو قاسمی کوڕی سلام بوو دەیفەرموو : ( کەسی شوێنکەوتەی سوننەت وەك دەستگرتوو بە پۆلای ئاگر وایە ، ئەمەش ئەمڕۆ لای من چاکترە لە شمشێر هاوێشتن لە پێناوی الله دا ) .

---

(67) شرح السنة للبغوي (171/1) ، الحجة في بيان المحجة (2/512) .

(68) صحيح مسلم کتێبی ئیمان (149) وە سونەنی ترمذي ئەبوابی ئیمان (2629) ، وە سونەنی ابن ماجه کتێبی فیتنه (3986) .

## ( وازهێنان له موكەلەفبوون له وەڵامدانەوەی پرسیارکەر )

وه ئەعمەش ڕیوایەتی کردووه له ئەبو ضحاوه له مەسروقەوه فەرمووی : چووین بۆ لای عبدالله ی کوڕی مەسعود فەرمووی : ( هۆ خەڵکینه ، ئەوەی شتێك دەزانێت با بیڵێت ، ئەوەشی نەیزانێت با بڵێت : الله زاناتره ، چونکه لەزانستەوەیه ئەگەر شتێك نەزانێت و بڵێت : الله زاناتره ، الله تعالى به پێغەمبەرەکەی ( صلى الله عليه وسلم ) فەرمووه : ( قُلْ مَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ وَمَا أَنَا مِنَ الْمُتَكَلِّفِينَ )[69] .

ئەبو عبد الله حافظ پێی ڕاگەیاندین : ئەبو عباس معقلي بۆی باسکردین : أحمد کوڕی عبدالجبار عطاردي بۆی باسکردین : باوکم بۆی باسکردم : عبدالرحمن ضبي بۆی باسکردم له قاسمی کوڕی عروەوه له محمدی کوڕی کعبی قرظیەوه فەرمووی : چوومە لای عومەری کوڕی عبدالعزیز ، زۆر به قوڵی سەیرم دەکرد ، جا فەرمووی : تۆ بەشێوەیەك سەیرم دەکەیت بەو شێوەیه نییه که له مەدینه سەیرت دەکردم ، گوتم : سەرنجم ڕادەکێشێت ، فەرمووی : چی سەرنجت ڕادەکێشێت ؟ گوتم : بۆچی گۆڕان بەسەر ڕەنگی پێست و لاشەت دا هاتووه ، وه قژەکانت بڵاوه ؟ فەرمووی : ئەی چی ئەگەر سێ ڕۆژ لەدوای مردنم له گۆڕەکەمدا بم بینیت ، چاوەکانم دەرهاتوون و لووتم چووەته ناو دەمم ، ئەوکات زۆر قوڵتر سەیرم دەکەیت ، فەرموودەیەکی بۆ باسکردم بۆم باسکرابوو له عبدالله ـی کوڕی عباسەوه ، فەرمووی : عبدالله ـی کوڕی عباس بۆی باس کردم فەرموودەکەی بەرز دەکردەوه بۆ پێغەمبەری الله ( صلى الله عليه وسلم ) که فەرموویەتی : هەموو شتێك شەرەفێکی هەیه ، وه بەشەرەفترین کۆڕ و دانیشتن ئەوەیه که ڕووی له قیبله بێت ، نوێژ لەدوای خەوتوو و بێ دەستنوێژ مەکەن ، وه مار و

(69) صحيح البخاري کتێبی تەفسیر (4809) ، وه صحيح مسلم کتێبی سیفەتی قیامەت و بەهەشت و دۆزەخ (2789) .

مارميلکە بکوژن ئەگەر لەناو نوێژەکانیشتان دا بوون ، وە دیوارەکان بە پۆشاك هەڵمەواسن ، وە ئەو کەسەش کە بەبێ رووخسەت وەرگرتن سەیری پەرتووکی براکەی بکات ئەوا سەیری ئاگر دەکات ، ئایا هەواڵی خراپترین کەستان پێ بڵێم ؟ گوتیان : بەڵی ئەی پێغەمبەری الله ، فەرمووی : ( ئەو کەسەی بە ناهەق جەلدە لەبەندەکەی دەدات ، وە ڕێگرە لە ئەنجامدانی سیلەی ڕەحم و بەخشین ، وە بەتەنها دابەزێت ، ئایا هەواڵی خراپتر لەو کەسەتان پێ نەڵێم ؟ ئەو کەسەی کە ڕقی لەخەڵکە و خەڵکیش ڕقیان لێیە ، ئایا خراپتر لەو کەسەتان پێ نەڵێم ؟ ئەو کەسەی کە پێکناهێتەوە و لێبوردە و لێخۆشبوو نییە ، ئایا خراپتر لەو کەسەتان پێ نەڵێم ؟ ئەو کەسەی کە خراپەی بۆ خەڵکی زۆرە و چاکەی کەمە ، ئەو کەسەی حەزدەکات بەهێزترین کەس بێت ئەوا با پشت بە الله تعالی ببەستێت ، وە ئەو کەسەشی کە حەزدەکات دەوڵەمەندترین کەس بێت ئەوا با ئەوەی لەدەستی الله یە زۆر لای پەسەند تر بێت لەوەی لەدەستی جگە لەوە ، وە ئەوەیشی حەزدەکات بەڕێزترین کەس بێت ئەوا با ببەخشێت ، عیسی علیە السلام بە قەومەکەی فەرموو : ئەی نەوەی ئیسرائیل ، بە حیکمەتەوە لای نەفامان قسە مەکەن چونکە ئەگەر بە حیکمەتەوە لای ئەو خەڵکەی شایستەن قسە نەکەن ئەوکاتە ستەمتان لێکردوون ، وە ستەم مەکەن و دەستخۆشی لە ستەمی ستەمکارێك مەکەن نەوەك فەزڵتان بەتاڵ ببێتەوە لای خواکەتان ، وە سێ شتەکە : کارێك زانیت هەقە ئەوا شوێنی بکەوە ، وە کارێك کە زانیت خراپە و گومڕاییە لێی دووركەوە ، وە شتێك کە ڕاجیاییتان دروست بوو لەسەر بیگەڕێننەوە بۆ لای الله تعالی )[70] .

(70) المنتخب مسند عبد بن حميد (1/225) بەژمارە (675) ، المستدرك لحاكم (7706) ، مسند حارث (2/967) ، السنن الكبرى للبيهقي (7/444) .

## ( بیروباوەڕی هاوەڵانی حەدیث لەسەر زیندووبونەوە و ڕووداوەکانی قیامەت )

وە ئەهلی دین و سوننەت بڕوایان هەیە بەوەی لەدوای مردن زیندووبونەوەی قیامەت هەیە ، وە هەموو ئەو شتانەی کە الله تعالی پێی ڕاگەیاندووین لە ڕووداوەکانی قیامەت هەقە ، وە جیاوازی حاڵی بەندەکان و دروستکراوەکان لەبابەتی ئەوەی کە لەوێدا الله تعالی دەبینن و پێی دەگەن لەو ڕۆژە نارەحەتەدا ، لەوەرگرتنی کتێبەکان بەدەستی ڕاست و چەپ ، وە وەڵامدانەوەی پسیارەکان ، وە هەموو ئەو ترس و لەرزانەی کە ڕوو دەدەن لەو ڕۆژە مەزنەدا ، وە شوێنی ڕووداوەکان ، لەصیراط و میزان و بڵاوبوونەوەی پەڕەکان کەبەڕادەی کێشی وردیلەیەك چاکە و خێری تێدا نوسراوە .

## ( شەفاعەت )

وە ئەهلی دین و سوننەت بڕوایان بەشەفاعەتی پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) هەیە بۆ کەسانی یەکخواپەرستی تاوانبار و ئەنجامدەرانی تاوانە گەورەکان ، وەك چۆن هەواڵی دروست هاتووە لە پێغەمبەری الله وە ( صلى الله عليه وسلم ) .
ئەبو سەعیدی کوڕی حمدون پێی ڕاگەیاندین : ئەبو حامدی کوڕی شەرقی پێی ڕاگەیاندین : أحمدی کوڕی یوسف سلمی بۆی باسکردین : عبد الرزاق بۆی باسکردین : مەعمەری کوڕی ثابت پێی ڕاگەیاندین لە ئەنەسەوە لە پێغەمبەری الله وە ( صلى الله عليه وسلم ) فەرموویەتی : ( شەفاعەتی من ئەنجامدەرانی تاوانە گەورەکان دەگرێتەوە لە ئومەتەکدا )[71] .

وە ئەبو علی زاهر کوڕی أحمد پێی ڕاگەیاندین : محمدی کوڕی موسەییب ئەرغیانی پێی ڕاگەیاندین : حەسەنی کوڕی عەرەفە بۆی باسکردین :عبدالسلام کوڕی حەرب ملائی بۆی باسکردین ، لەزیادی کوڕی خەیثەمەوە لە نەعمانی کوڕی قرادەوە ، لە

(71) مسند الإمام أحمد (13222) ، سوننی ئەبو داود کتێبی سوونەت (4739) ، سوننی ترمذي سیفەتی قیامەت (2435) ، سوننی ابن ماجه کتێبی الزهد (4310) .

عبدالله ــی کوڕی عەمرەوە فەرمووی : پێغەمبەری الله ( صلى الله عليه وسلم ) فەرمووی : ( سەرپشك كرام لەنێوان شەفاعەت و لەنێوان چوونی کۆمەڵێکی ئوممەتەکەم بۆ بەهەشت ، منیش شەفاعەتم هەڵبژارد ، چونکە گشتیە و بەسە ، ئایا وایدەبینن شەفاعەتم بۆ ئیماندارانی لەخواترسە ؟ نەخێر ، بەڵکو بۆ تاوانباران و تێکەوتووان و هەڵەکراوانە )[72] .

ئەبو محمد مجلدی پێی ڕاگەیاندین : ئەبو عباس سراج پێی ڕاگەیاندین : قتيبەی کوڕی سعید بۆی باسکردین : عبدالعزیزی کوڕی محمد دراوردی بۆی باسکردین لە عەمری کوڕی ئەبو عەمر ، وە ئەبو طاهری کوڕی خزیمە پێی ڕاگەیاندین : ئیمام محمدی کوڕی ئیسحاق کوڕی خزیمە پێی ڕاگەیاندین : علی کوڕی حجر ــی کوڕی ئیسماعیلی کوڕی جەعفەر بۆی باسکردین ، لە عەمری کوڕی ئەبو عەمر ، لە سعیدی کوڕی ئەبو سعید مقبریەوە ، لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای الله لەسەری بێت کەوا فەرموویەتی : ( ئەی پێغەمبەری الله کێ شادترین کەسە بە شەفاعەتەکەی تۆ لە قیماتەدا ؟ فەرمووی : ( وای بۆچووم کە کەس نەبێت لەتۆ زیاتر یەکەم کەس بێت ئەو پرسیارەم لێبکات کاتێك کە پێداگریتم بینی لەسەر حەدیث ، شادترین کەس بە شەفاعەتی من لەڕۆژی قیامەتدا ئەو کەسەیە کە : بە خاڵسی لەگەڵ نەفسی خۆیدا بلێت لا اله الا الله )[73] .

## ( حەوز و کەوثەر )

وە هاوەڵانی حەدیث بڕوادەهێنن بە حەوز و کەوثەر ، وە چوونی کۆمەڵەیەك لە خواپەرستان بۆ ناو بەهەشت بەبێ لێپرسینەوە ، وە لێپرسینەوەی کۆمەڵەیەکیان بەلێپرسینەوەیەکی ئاسان و خستنیان بۆ ناو بەهەشت بەبێ توشبوونیان بە

---

(72) مسند الإمام أحمد (5452) ، سوونەنی ابن ماجه کتێبی الزهد (4311) ، المعجم الكبير للطبراني (13/191) بەژمارە (13900) ، السنة لإبن أبي عاصم (791) .

(73) صحيح البخاري کتێبی العلم : (99) .

خـــراپەیەك و بەبـــێ ئەوەی ســـزاییێکیان لەســـەر بمێنێـــت ، وە خســـتنەناوی کۆمەڵەیەك لە تاوانباران بۆ ناو ئاگر و ئینجا ڕزگار دەکرێن یاخود دەردەهێنرێن لەئاگـــر و بەدوای ئەو برایانەیـــان دەکەون کە لەپـــێش ئەوان چـــوونەتە نـــاو بەهەشت ، وە بەهەتاهەتایی لە ئاگردا نامێننەوە ، بەڵام کافران ئەوا تاهەتایی لە ئاگردا دەمێننەوە و هەرگیز دەرناهێنرێن ، وە الله تعالی هیچ یەکێك لە کۆمەڵەی ئیمانداارانی تاوانباران لەناو ئاگردا بۆ هەتا هەتایی ناهێڵێتەوە .

## ( بینینی ئیمانداران بۆ خوای خۆیان لە ئاخیرەتدا )

وە ئەهلی سوننە شایەدی ئەوە دەدەن کە ئیمانداران خوای خۆیان تبارك و تعالی بە چاوەکانیـان دەبیـنن و سـەیری دەکەن ، لەسـەر ئەو هەواڵە دروسـتانەی کە هاتووە لە پێغەمبەری الله وە ( صلی الله علیه وسلم ) ، وەك لە فەرموودەکەیدا : ( ئێـوە پـەروەردگارتان دەبیـنن وەك چـۆن مـانگی شـەوی بەدر دەبیـنن )[74] وە لێکچـوونەکەش وەك بینـین بە بینیـنە ، وە ئەو هەواڵانەی هـاتووە سـەبارەت بە بینین بەسەنەد و ڕێگاکانی خۆی دەرهێنراوە لە کتێبی ( الأنتصار ) .

## ( بڕواهێنان بە بەهەشت و دۆزەخ و بەوەی کە دوو دروستکراون )

وە ئەهلی سوننە شایەدی ئەوە دەدەن کە بەهەشت و دۆزەخ دوو دروستکراون ، وە دەمێنـنەوە و هەرگیـز کۆتاییـان پـێ نـایەت ، وە خەڵکـی بەهەشـت هەرگیـز لەبەهەشـت دەرنـاهێنرێن ، بەهەمـان شـێوە خەڵکـی دۆزەخـیش بـۆ ئەوە دروسـتکراون و هەرگیـز دەرنـاهێنرێن ، وە لەو ڕۆژەدا جاڕدەرێـك جـاڕ دەدات و دەڵێت : ( ئەی خەڵکی بەهەشت تێیدا بمێننەوە و مردن نییە ، وە ئەی خەڵکی دۆزەخ تێیـدا بمێنـنەوە و مـردن نیـیە ) لەسـەر ئەو هەواڵە دروسـتەی کە لە پێغەمبەری الله وە صلی الله علیه وسلم هاتووە .

(74) صحيح البخاري : (554)، صحيح مسلم : (633) .

## ( ئیمان : وته و کرداره زیاد دەکات و کەم دەکات )

له ڕێڕەوی ئەهلی حەدیث ئەوەیە کە ئیمان وته و کردار و ناسینه ، زیاد دەبێت به گوێڕایەلی و کەمیش دەبێت به سەرپێچی .

( محمدی کوڕی حەسەن کوڕی شەقیق فەرموویەتی : پرسیارم کرد له ئەبو عبدالله احمدی کوڕی حەنبەل دەربارەی زیاد و کەمبوونی ئیمان ، فەرمووی : حەسەنی کـوڕی موســی ئەشیــەب بـۆی باس کردیــن : حەمادی کـوڕی سەلەمـە بۆی بـاس کـردین له ئەبـو جەعـفەر خەطەمیەوە لەبـاوکیەوە له بـاپیریەوە له عـومەری کـوڕی حەبیـبە و فەرمـوویەتی : ئیمـان زیـاد و کەم دەکـات ، گـوترا : زیـادبوون و کەمبـونەوەی چیـیە ؟ فەرمـووی : ئـەگەر یـادی الله تعـالی مـان کــردەوە و سوپاسمـان کرد ئەوا زیادبوونەکەیەتی ، وە ئەگەر یادیمان لەبیرکرد و ونمان کرد ئەوا کەم بوونەوەکەیەتی )[75] .

ئەبــو حەســەن کوڕی ئەبو ئیسحــاق مەزەکی پێــی ڕاگەیاندیــن : باوکـم بــۆی باس کردین : ئەبو عومەر حیری بۆی باسکردین : محمدی کوڕی یحیـی ذوهەلی و محمدی کوڕی ئیدریس مەکی و احمدی کوڕی شداد ترمذی فەرموویان : حەمیدی بۆی باسکردین : یحیـی ی کوڕی سەلیم بۆی باسکردین فەرمووی : پرسیارم کرد له دە زانـا و شـارەزا دەربـارەی ئیمـان فەرموویـان : وته و کـرداره ، پرسیـارم کـرد له ئیبنو جریج فەرموی : وته و کرداره ، وە پرسیارم کرد لەسوفیانی ثەوری فەرمووی : وته و کرداره ، وە پرسیارم کرد له مثنی ی کوڕی صباح فەرمووی : وته و کرداره ، وە پرسیـارم کـرد له محمـدی کـوڕی موسـلیم طـائفی فەرمـووی : وته و کرداره ، وە پرسیارم کرد له فوضەیلی کوڕی عیاض فەرمووی : وته و کرداره ، وە پرسیارم کرد له نـافیع کـوڕی عـومەر جمحـی فەرمـووی : وته و کـرداره ، وە پرســیارم کـرد له سوفیانی کوڕی عویینه فەرمووی : وته و کرداره .

(75) صريح السنة لإبن جرير الطبري : (28) ، حديث السراج : (3/80) ، شعار أصحاب الحديث : (8) .

( وە ئەبو عەمری حیری پێی ڕاگەیاندین : محمدی کوڕی یحیـی و محمدی کوڕی ئیدریس بۆیان باسکردین فەرموویان : گوێمان لە حەمیدی بوو دەیفەرموو : گوێم لە سـوفیانی کـوڕی عـویینە بـوو دەیفەرمـوو : ئیمـان وتە و کـردارە ، زیـاد و کەم دەکات ، براکەی ئیبراهیمی کوڕی عویینە پێی گوت : ئەی باوکی محمد دەڵێی : کەمدەکات ؟ فەرمووی : بێدەنگبە ئەی منداڵ ، بەڵکو کەم دەکات تاوەك هیچ نامێنێت )[76] .

وە ولیدی کوڕی موسلم فەرموویەتی: گوێم لە ئەوزاعی و مالیك و سەعیدی کوڕی عبدالعزیز بوو نکۆڵیان لەو کەسە دەکرد کە دەڵێت : دانپیانـان بە ئیمان بەبێ کردار ، وە دەیان فەرموو : ئیمان نییە بەبێ کردار .
گوتم : ئەو کەسەی کە گوێڕایەڵی و چاکەکانی زیاتر بێت ئەوا تەواوترینی ئیمانە ، ئەوەشـی گـوێڕایەڵی کەم بێـت و تـاوان و سـەرپێچی و لەبیرکردنـی زۆر بێـت ئەوا ئیمانەکەی کەمی تێدایە .

( وە گوێم لە حاکم ئەبو عبدالله حافظ بوو دەیفەرموو : گوێم لە ئەبوبەکر محمد کوڕی احمد کوڕی باکویە حەلاب بوو دەیفەرموو : گوێم لە ئەبوبەکر محمد کوڕی ئیسحاق کوڕی خوزەیمە بوو دەیفەرموو : گوێم لە أحمدی کوڕی سەعید رباطی بوو دەیفەرموو : عبدالله ی کوڕی طاهر پێی گوتم : ئەی أحمد ، ئێوە بە نەزانی ڕقتان لەو قەومە دەبێتەوە ، منیش بە زانین ڕقم لێیان دەبێتەوە ، یەکەم شتیان ئەوەیە گـوێڕایەڵی دەسـەڵاتدار بەدروسـت نـابینن ، وە ئیمـان لای ئەوان هـیچ نرخێکی نییە ، سوێند بە الله من بەدروستی نازانم بلێم : ئیمانی من وەك ئیمانی یحیـی ی کـوڕی یحیـی یە ، وە نەوەك ئیمـانی أحمـدی کـوڕی حەنـبەلە ، کەچـی ئەوان دەڵێن : ئیمانمان وەك ئیمانی جوبرائیل و میکائیلە .

---

(76) الشريعة للآجري : (2/607) به ژماره : (244) ، الإبانة الكبرى لإبن بطة به ژماره : (1155) ، شرح أصول أعتقاد أهل السنة والجماعة بەژماره : (1745) .

وە گوێم لە حاكم بوو دەیفەرموو : گوێم لە ئەبو جەعفەر محمدی كوڕی صالح كوڕی هانی بوو دەیفەرموو : گوێم لە ئەبو بەكر محمدی كوڕی شوعەیب بوو دەیفەرموو : گوێم لە ئیسحاقی كوڕی ئیبراهیم حنظلی بوو دەیفەرموو : ئیبنو موبارەكی ریی هاتە لامان یەكێك لە بەندەكان بۆی هاتە پێشەوە وای گومان برد كە مەزهەبی خواریجی هەیە ، پێی گووت : ئەی باوكی عبدالرحمن چی دەڵێی سەبارەت بە وكەسەی زینا دەكات و دزی دەكات ومەی دەخواتەوە ؟ فەرمووی : لە ئیمان نایبەمە دەرەوە ، گوتی : ئەی باوكی عبدالرحمن ، بەتێپەڕبوونی تەمەنت و گەورەبوونت بویت بە مورجیئە ؟ فەرمووی : مورجیئە منیان پێ قبوڵ نییە ، مورجیئە دەڵێن : چاكەكانمان قبوڵكراوە و خراپەكانمان سڕاوەتەوە ، وە گەر بم زانیبوایە چاكەیەكم لێ قبوڵ بووە ئەوا شایەدی ئەوەم دەدا كە لەبەهەشتم ، ئینجا باسی كرد لە ئەبو شەوذب لە سەلەمەی كوڕی كهیلەوە ، لە هذیلی كوڕی شرحبیلەوە فەرمووی : عومەری كوڕی خەتاب ڕەزای الله لەسەری فەرموویەتی : ( ئەگەر ئیمانی ئەبو بەكر بەراورد بكرابوایە بە ئیمانی خەڵكی سەر زەوی ئەوا ئیمانی ئەبوبەكر گرانتر دەبوو )[77] .

گوێم لە ئەبوبەكر محمد كوڕی عبدالله كوڕی محمد كوڕی زەكەریا شەیبانی بوو دەیفەرموو : گوێم لە یحیی ی كوڕی مەنصوری قازی بوو دەیفەرموو : گوێم لە محمدی كوڕی ئیسحاق كوڕی خوزەیمە بوو دەیفەرموو : گوێم لە حەسەنی كوڕی حەرب برای أحمدی كوڕی حرب بوو دەیفەرموو : شایەدی دەدەم ئەو دینەی كە أحمدی كوڕی حەرب لەسەری بوو ئەوە بوو كە ئیمان و تەو كردارە زیاد و كەم دەكات )[78] .

(77) هەریەكە إبن بطة لە الإبانة الكبری : (9/807) ، وە بەیهەقی لە شعب الإیمان : (1/134) ئەو وتەیەی عومەریان لەڕێگای عبدالله ی كوڕی موبارەكەوە ڕیوایەت كردووە .

(78) ئەو ئاثارانە هەمووی إسحاق ابن راهوية هێناویەتیەوەلەمەسنەدەكەیدا : (3/670) .

## ( ئيماندار بەهەموو تاوانێك كافر نابێت )

وە ئەهلی سوننە بڕوایان وایە ئیماندار ئەگەر تاوانی زۆریش بكات بچووك بێت یان گەورە ئەوا كافر نابێت بەهۆی ئەو تاوانانەوە ، ئەگەر لە دونیاش دەرچێت بەبێ تەوبەكردن لەو تاوانانە و لەسەر یەكخواپەرستی و ئیخلاس بمرێت ئەوا بڕیاری بۆ لای الله تعالی یە ، ئەگەر ویستی لەسەر بێت لێی دەبورێت و دەیخاتە بەهەشتەوە لەڕۆژی قیامەتدا بە ساغ و سەلامەتی بەبێ تاقیكردنەوەی بە ئاگر و سزادانی لەسەر ئەوەی ئەنجامی داوە و ئینجا بردویەتی بۆ ڕۆژی قیامەت لەخراپە و لاریەتی ، وە ئەگەر ویستی لەسەر بێت لێی دەبورێت و ماوەیەك بە ئاگری دۆزەخ سزای دەدات ، وە كە سزایدا ئەوا بۆ تاهەتایی لەنێو دۆزەخی دا ناهێلێتەوە ، بەڵكو ڕزگاری دەكات و دەری دەهێنێت بۆ خۆشی شوێنی بەردەوامی و هەتا هەتایی .

وە شێخمان سوهەیلی كوڕی محمد ڕەحمەتی الله لەسەری دەفەرمووێت : ئیمانداری تاوانبار ئەگەر بە ئاگریش سزا بدرێت ئەوا وەك خستنی كافران ناخرێتە ناویەوە ، وە وەك كافران تێیدا نامێنێتەوە ، وە وەك كافر ئازاری تێدا ناچێژێت ، وە مانای ئەوەیە كە كافر لەسەر ڕووخساری بۆ ناو دۆزەخ ڕادەكێشرێت ، وە بە سەر شۆری و خەجاڵەتی دەخرێتە ناو دۆزەخ و ئاگری هەڵگیرساو بە دەست كۆت و زنجیرەوە ، وە ئیمانداری تاوانبار ئەگەر بە ئاگریش تاقی بكرێتەوە ئەوا دەچێتە ناو ئاگرەوە وەك چۆن ستەمكار لەدونیادا دەچێتە بەندینخانەوە بەبێ مانەوەی تێیدا ، وە مانای وتەكەی : ( وەك كافران ناخرێتە ناو ئاگرەوە ) ئەوەیە كە كافر هەموو لاشەی دەسوتێت ، هەركاتێك پێستێكی سوتا پێستێكی تری بۆ دێتەوە تاوەكو سزا بكێشێت ، وەك الله تعالی ڕوونی كردۆتەوە لە قورئانەكەیدا لە فەرمایشتی : ( إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا بِآيَاتِنَا سَوْفَ نُصْلِيهِمْ نَارًا كُلَّمَا

نَضِجَتْ جُلُودُهُم بَدَّلْنَاهُمْ جُلُودًا غَيْرَهَا لِيَذُوقُوا الْعَذَابَ ﴾[79] ، بەڵام ئیمانداران ئاگر ڕووخساریان ناگرێت و شوێنی ئەندامانی سوجدە بردنیان ناسوتێت ، کە الله تعالی ئەندامانی سوجدەبردنیانی حەرام کردووە لە ئاگر .

وە مانـای وتەی : ( وەك کـافران لە ئاگـردا نـامێنێتەوە ) ئەوەیە کەوا کـافر بـۆ هەمیشـەیی لە ئاگـردا دەمێنێـتەوە و هەرگیـز لە دۆزەخ نـایەتە دەرەوە ، وە الله تعالی هیچ یەکێك لە ئیماندارانی تاوانبار بۆ هەمیشەیی لەئاگردا ناهێلێتەوە ، وە واتای وتەی ( وەك کافر ئازاری تێدا ناچێژێت ) ئەوەیە کە کافران بێ ئومێد دەبن لە بەزەیـی الله تعـالی وە بەهـیچ شـێوەیەك تکـای ئاسـودەیی نـاکەن ، بەڵام ئیمانـداران تکـاکردن وتەماعیـان نابڕێـت لە بەزەیـی الله تعـالی ، وە سـەرئەنجامی هەموو ئیمانداران بەهەشتە ، چونکە بۆ ئەوە دروستکراون وبەهەشت بۆ ئەوان دروست کراوە وەك فەزڵ و منەت لەلایەن الله تعالی ـەوە .

## ( حوکمی نوێژنەکەر )

وە هـاوەڵانی حەدیـث ڕاجیایـان هەبـووە دەربـارەی وازهێنـانی موسـڵمان بە ئەنقەسـت لە نوێـژی فەرز ، أحمـدی کـوڕی حەنـبەل و کۆمەڵێـك لە زانایـانی سـەلەف کافریـان کـردووە و لە ئیسـلام بردوویـانەتەدەر ، بەهـۆی فەرمـوودەی صحیح : ( لەنێـوان بەنـدەو وشـیرك وازهێنانە لەنوێژ ، ئەوەی واز لەنـوێژ بێنێـت ئەوا کـافر بـووە )[80] ، وە شـافعی و هـاوەڵانی و کۆمەڵێـك لە زانایـانی سـەلەف بـۆ ئەوە چوون کە کافر نابێت مادام بڕوای بە واجبێتی هەیە ، بەڵکو کوشتنی واجب دەبێـت وەك چـۆن هەڵـگەڕاوە لە ئیسـلام کوشـتنی واجـب دەبێـت ، وە فەرموودەکەیان بەوازهێنان لەنوێژکردن بە نکۆڵیکردن لەواجبێتی لێکداوەتەوە ،

(79) سورة النساء : 56 .

(80) هەریەکە لە مروذي لە تعظیم قدر الصلاة : (2/880) ، و أبو یعلی لە مەسنەدەکەیدا : (7/137) بەو لەفزە ڕیوایەتیان کردووە .

وەك الله تعالى هەواڵی داوە دەربارەی یوسف علیه السلام كە فەرموویەتی : ( إِنِّي تَرَكْتُ مِلَّةَ قَوْمٍ لَّا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَهُم بِالْآخِرَةِ هُمْ كَافِرُونَ )[81] ، وە بەهۆی توشبوون بەكوفری وازهێنەران نەبوو ، بەڵكو وازهێنانەكەی بەهۆی نكۆڵی كردنەوە دەبێت .

## ( دروستكراویەتی كردەوەی بەندەكان )

وە لە وتەی ئەهلی سوننەت وجەماعەت دەربارەی كردەوەی بەندەكان ئەوەیە كە دروستكراوە لەلایەن الله تعالى ـەوە ، وە ئەوەی نكۆڵی لەو وتەیە بكات یان ڕەتی بكاتەوە لە كۆمەڵەی ڕێنمونی كراوان و ئەهلی دین هەژمار ناكرێت .

## ( ڕێنموونی لەلایەن الله تعالى ـەوەیە )

وە شایەدی ئەوە دەدەن كە الله تعالى ڕێنمونی هەركەسێك دەكات كە ویستی لەسەرە و هەركەسێكیش گومڕا دەكات كە ویستی لەسەرە ، هیچ بەهانەیەك نییە بۆ ئەو كەسەی كە الله گومڕای كردووە و هیچ عوزری بۆ نییە ، الله تعالى فەرموویەتی : ( قُلْ فَلِلَّهِ الْحُجَّةُ الْبَالِغَةُ ۖ فَلَوْ شَاءَ لَهَدَاكُمْ أَجْمَعِينَ )[82] ، وە فەرموویەتی : ( وَلَوْ شِئْنَا لَآتَيْنَا كُلَّ نَفْسٍ هُدَاهَا وَلَٰكِنْ حَقَّ الْقَوْلُ مِنِّي لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنَ الْجِنَّةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ )[83] ، وە فەرموویەتی : ( وَلَقَدْ ذَرَأْنَا لِجَهَنَّمَ كَثِيرًا مِّنَ الْجِنِّ وَالْإِنسِ )[84] پەروەردگات دروستكراوەكانی دروستكردووە بەبێ ئەوەی كە پێویستی پێیان بێت ، وە كردنی بەدوو كۆمەڵە : كۆمەڵەیەك بۆ بەهەشت وەك پاداشتێك ، وە كۆمەڵیەك بۆ دۆزەخ وەك دادپەروەری ، وە كردوونی بە سەرلێشێواو و ژیر ، وە بەدبەخت و كامەران ، وە نزیك لە بەزەیی خۆی و دوور

(81) سورة يوسف : 37 .
(82) سورة الأنعام : 149 .
(83) سورة السجدة : 13 .
(84) سورة الأعراف : 179 .

لەبەزەیـی : ( لَا يُسْـأَلُ عَمَّـا يَفْعَـلُ وَهُـمْ يُسْـأَلُونَ )[85] ، وە فەرمـوویەتی : ( أَلا لَـهُ الْخَلْقُ وَالأَمْرُ تَبَارَكَ اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ )[86] ، وە فەرمویەتی: ( كَمَا بَدَأَكُمْ تَعُودُونَ * فَرِيقًا هَدَى وَفَرِيقًا حَقَّ عَلَيْهِمُ الضَّلالَةُ إِنَّهُمُ اتَّخَذُوا الشَّيَاطِينَ أَوْلِيَاءَ مِنْ دُونِ اللَّهِ وَيَحْسَـبُونَ أَنَّهُـمْ مُهْتَـدُونَ )[87] ، وە فەرمـوویەتی : ( أُوْلَئِـكَ يَنَـالُهُمْ نَصِـيبُهُمْ مِـنَ الْكِتَـابِ )[88] ، ئیبنو عباس ڕەزای الله لەسەری بێت فەرمـوویەتی : ( ئەوە ئەوەیە کە بۆیان دیاریکراوە لە بەدبەختی و کامەرانی ) [89] .

ئەبـو محمـد مخلـدی پێـی ڕاگەیانـدین : ئەبـو محمـد عبـاس سـراج پێـی ڕاگەیانـدین : یوسفی کوڕی موسی بۆی باسکردین : جەریر بۆی باسکردین لە ئەعمەشەوە لە زەیدی کوڕی وەهبەوە لە عبدالله ـی کوڕی مەسعودەوە فەرمـوویەتی : پێغەمبەری الله ( صلی الله علیه وسلم ) کە ڕاستگۆترین ڕاستگۆیە فەرمـوویەتی : ( هەریـەکێ لەئێوە لەماوەی چل ڕۆژدا لەسکی دایکیدا خەلق دەکرێت ، لەماوەی چل ڕۆژدا دەبێتـە پارچەیـەك گۆشـت و خـوێن ، پـاش مـاوەی چـل ڕۆژیـش دەبێتـە پارچـە گۆشتێك ، پاش ئەوە خوای گەورە فریشتەیەك دەنێرێت ڕۆح دەکات بەبەریدا و فـەرمانی بـەچوار و شـەش پێـدەکرێت : بەنووسـینی ڕۆزیـی ، درێژیـی ژیـانیی (ئەجـەلی) و کـاریی ، بەدبەختـە یـان بەختـەوەر ، سـوێند بـەوەی جگـە لـەو خوایـەکیتر نییـە ، کەسـی واتـان هەیـە کـاروکردەوەی بەهەشـتیی دەکـات هـەتا لـەنێوان ئـەو بەهەشـتا ئەنـدازەی گـەزێکی دەمێنـێ ، کـەچی نووسـراوەکە پێشـی دەکـەوێت و کـار و کـردەوەی دۆزەخیـی دەکـات و دەچێتـە دۆزەخ ، هەروەهـا کەسی واشتان هەیە کار و کرداری دۆزەخیی دەکات ، هەتا بەئەندازەی گەزێکی

(85) سورة الأنبياء : 23 .

(86) سورة الأعراف : 54 .

(87) سورة الأعراف : 29 _ 30 .

(88) سورة الأعراف : 37 .

(89) سەیری تەفسیری ابن جریری طبری بكە : (12/410) .

دەمێنێ و نووسراوەکە پێشی دەکەوێت و کار و کردەوەی بەهەشتیی دەکات و دەچێتە بەهەشتەوە )[90] .

وە ئەبو ئەبو محمد مخلدی پێی ڕاگەیاندین : ئەبو عەباسی سواد پێی ڕاگەیاندین : ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیم حنظلی - کە ئیسحاق ئیبنو راهویە یە - بۆی باسکردین : عبدالصمدی کوڕی عبدالوارث پێی ڕاگەیاندین : حمادی کوڕی سەلەمە بۆی باسکردین لە هیشامی کوڕی عورووەوە لە باوکیەوە لە عائیشەوە ڕەزای الله لەسەری بێت فەرموویەتی : پێغەمبەری الله ( صلى الله عليه وسلم ) فەرموویەتی : ( کەسی وا هەیە کار و کردەوەی بەهەشتیی دەکات ، کەچی لە پەرتووکدا نوسراوە دۆزەخیە ، جا ئەگەر پێش مردنی کار و کردەوەی دۆزەخیانی کردبێت و بمرێت ئەوا دەچێتە دۆزەخەوە ، وە کەسی وا هەیە کار و کردەوەی دۆزەخیی دەکات ، کەچی لە پەرتووکدا نوسراوە بەهەشتیە ، جا ئەگەر پێش کردنی کار و کردەوەی بەهەشتیانی کردبێت و بمرێت ئەوا دەچێتە بەهەشتەوە )[91] .

## ( ڕێڕەوەی ئەهلی سوننە دەربارەی چاکە و خراپە و سوود و زیان )

وە ئەهلی سوننە بڕوایان وایە و شایەدی دەدەن کە چاکە و خراپە و سوود وزیان بە قەزا و قەدەری الله تعالى یە ، وە گەڕانەوە و دەرچوون و لادان نیيە لەقەدەری الله تعالى دا ، وە مرۆڤ توشی هیچ شتێك نابێت ئیلا ئەوە نەبێت کە پەروەردگاری بۆی نوسیوە ، وە گەر دروستکراوەکان تێبکۆشن بۆ ئەوەی سوود بە مرۆڤیك بگەیێنن کە الله تعالى بۆی نەنوسیوە لەتوانایان دا نیيە ، وە ئەگەر تێبکۆشن بۆ ئەوەی زیانێکی لێبدەن کە الله تعالى دیاری نەکردووە لەتوانایاندا نیيە ، لەسەر ئەو هەواڵەی کە لە عبدالله ی کوڕی عەباسەوە هاتووە لە

(90) صحيح البخاري : (3280) ومسلم : (2643) .
(91) صحيحه : مسند الإمام آحمد : (3/257) .

پێغەمبەرەوە ( صلى الله عليه وسلم ) ، الله تعالى فەرموویەتی : ( وَإِن يَمْسَسْكَ اللَّهُ بِضُرٍّ فَلَا كَاشِفَ لَهُ إِلَّا هُوَ ۖ وَإِن يُرِدْكَ بِخَيْرٍ فَلَا رَادَّ لِفَضْلِهِ ۚ )[92] .

وە لە ڕێرەوەی ئەهلی سوننە و ڕێبازیان لەگەڵ ئەو وتەیەشیان کە خەیر و شەڕ لەلایەن الله ـەوەیە و قەزای ئەوە لەگەڵ ئەوەش کەموکورتی نادرێتە پاڵ الله تعالى ، وەك بگوترێت : ئەی دروستکەری مەیمون و بەراز و قاڵۆچە و سیسرك ، ئەگەر هیچ دروستکراوێکیش نەبێت ئیلا الله دروستکەری بێت ، دەربارەی ئەوەش وتەی پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) هاتووە سەبارەت بە نزای دەستپێکردن : ( مەزنایەتی و بەرزی بۆ تۆ ، وە خەیر بەدەستی تۆیە ، وە شەڕیش بۆ تۆ نییە )[93] ، وە ماناکەشی ئەوەیە الله ش زاناترە ، شەڕ نادرێتە پاڵت وەك ئیفراد و مەبەست ، تاوەکو لە بانگکردندا پێت بگوترێت : ئەی دروستکەری شەڕ یاخود ئەی بە قەدەر دانانی شەڕ ، ئەگەر ئەویش دروستکەر و بەقەدەر دانانی هەموویان بێت ، بەو هۆکارە خضر عليه السلام ویستی عەیبداری و کەموکورتی داوەتە پاڵ خۆی ، وەك لە وتەی الله تعالى دا : ( أَمَّا السَّفِينَةُ فَكَانَتْ لِمَسَاكِينَ يَعْمَلُونَ فِي الْبَحْرِ فَأَرَدتُّ أَنْ أَعِيبَهَا )[94] ، بۆیە کاتێك کە باسی خەیر و چاکە و بەزەیی کردووە داویەتیە پاڵ ویستی الله تعالى ، فەرمووی : ( فَأَرَادَ رَبُّكَ أَن يَبْلُغَا أَشُدَّهُمَا وَيَسْتَخْرِجَا كَنزَهُمَا رَحْمَةً مِّن رَّبِّكَ )[95] ، هەر بۆیە دەربارەی ئیبراهیم عليه السلام فەرموویەتی کە ئیبراهیم عليه السلام فەرموویەتی : ( وَإِذَا مَرِضْتُ فَهُوَ يَشْفِينِ )[96] کە نەخۆشی داوەتە پاڵ خۆی و چاکبوونەوەش بۆ لای الله ی پەروەردگاری ئەگەر هەردووکیشی لە لایەن الله تعالى وە بێت .

(92) سورة هود : 107 .

(93) صحيح مسلم : (771) .

(94) سورة الكهف : 79 .

(95) سورة الكهف : 82 .

(96) سورة الشعراء : 80 .

## ( جۆرەكانی ویستن و ئیرادە )

وە لە ڕێڕەوەی ئەهلی سوننەت و جەماعەت ئەوەیە كە الله تعالی ویستی هەیە بۆ هەموو كردەوی بەندەكان شەڕ و خراپەیان ، هیچ كەسێك ئیمانی نەهێناوە تەنیا بە ویستی ئەو نەبێت وە هیچ كەسێك كافر نەبووە تەنیا بە ویستی ئەو نەبێت ، وە ئەگەر ویستی لەسەر هەبوایە ئەوا خەڵكی دەكرد بەیەك ئومەت و یەك كۆمەڵ ، وە ئەگەر ویستی هەبوایە سەرپێچی نەكرێت ئەوا ئیبلیسی دروست نەدەكرد ، جا كوفری كافران و ئیمانی ئیمانداران بە قەزا و قەدەر و بڕیار و ویستی الله تعالی یە ، ویستی لەسەر هەموو ئەو شتانە هەبووە و بڕیاری لەسەرداوە ، وە بە ئیمان و گوێڕایەڵی ڕازیە ، وە ڕقی لەكوفر و سەرپێچیە ، الله تعالی فەرموویەتی : ( إِن تَكْفُرُوا فَإِنَّ اللَّهَ غَنِيٌّ عَنكُمْ ۖ وَلَا يَرْضَىٰ لِعِبَادِهِ الْكُفْرَ ۖ وَإِن تَشْكُرُوا يَرْضَهُ لَكُمْ ۗ )[97] .

## ( جیاكاری لە ئیماندا وە شایەدیدان لەسەر كەسی دیاریكراو بەوەی بەهەشتیە یان دۆزەخی )

وە هاوەڵانی حەدیث شایەدی دەدەن و بڕوایان وایە كە سەرئەنجامی بەندەكان نەزانراوە ، چارەنووسی هیچ كەسێك نازانرێت بەچی كۆتایی پێ دێت ، وە حوكمی بەهەشتیبوون نادەن بۆ هیچ كەسێكی دیاریكراو ، وە حوكمی دۆزەخیش نادەن بۆ هیچ كەسێكی دیاریكراو ، چونكە ئەوە شاراوەیە لێیان ، نازانن مرۆڤ لەسەر چی دەمرێت ، بۆیە دەڵێن : ئێمە ئیمانداریـن بە ویستی الله ، وە شایەدی دەدەن بۆ ئەو كەسەی كەوا لەسەر ئیسلام مردبێت بەوەی چارەنووسی چوونە بەهەشتە ، ئەوانەی كە لەپێشوودا بڕیاری ماوەیەك سزادانیان بە ئاگر بۆدراوە لەلایەن الله تعالی ـەوە بەهۆی ئەو تاوانانەی كە ئەنجامیان داوە و تەوبەیان لێ نەكردووە ئەوا لەكۆتاییەكەیدا دەچنە بەهەشتەوە و هیچ كەسێك لە موسڵمانان لە ئاگردا

(97) سورة الزمر : 7 .

نامێننەوە ، بە فەزڵ و منەتی الله تعالی ، وە ئەوەشی لەسەر کوفر بمرێت - پەنا بە الله تعـالی - ئەوا چارەنووسـی چـوونە دۆزەخە و ڕزگـاری نابێـت لێـی ، وە مانەوەکەی لەو شوێنەدا کۆتایی بۆ نییە .

## ( مژدەپێدراوانی بەهەشت )

بەڵام ئەو کەسانەی کە پێغەمبەری الله ( صلی الله علیه وسلم ) شایەدی بۆ داون لە هـاوەڵانی بەوەی خەڵکـی بەهەشـتن ، ئەوا هـاوەڵانی حـدیث شـایەدیان بـۆ دەدەن بە بەڕاسـت دانـانی پێغەمـبەری ( صـلی الله علیـه وسـلم ) لەوەی باسـی کردووە و بەڵێنەکەی کە پێیانی داوە ، چونکە پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) شـایەدی بۆیـان نەداوە تەنیـا دوای ئەوەی کە زانیـویەتی ، وە الله تعـالی ئەو شتانەی کە ویستوویەتی لە زانستی نادیارەکان ( علم الغیب ) بە پێغەمبەرەکەی ڕاگەیاندووە ، وەك ڕوونە لە وتەی الله تعالی دا : ( عَالِمُ الْغَيْبِ فَلَا يُظْهِرُ عَلَىٰ غَيْبِهِ أَحَدًا * إِلَّا مَنِ ارْتَضَىٰ مِن رَّسُولٍ )[98] ، وە دە (10) لە هـاوەڵانی پێغەمـبەری الله مژدەی بەهەشـتیان پێـدراوە ، ئەوانـیش ( ئەبـوبەکر و عـومەر و عوثمـان و علی و طلحە و زوبەیر و عبدالرحمنی کوڕی عەوف و سـەعد و سـەعید و ئەبـو عوبەیدەی کوڕی جەڕاح )[99] ، بەهەمان شێوە پێغەمبـەر ( صلی الله علیه وسلم ) بە ثابتـی کوڕی قەیسـی کوڕی شماسی فەرموو خەڵکی بەهەشتە ، ئەنەسی کوڕی مالیك فەرموویەتـی : ( ثابـت لەنێـوان ئێمـەدا تێـدەپەڕی ئـێمەش دەمـان گـوت : بەهەشتیە )[100] .

---

(98) سورة الجن : 26 ــ 27 .

(99) مسند احمد : (1675) ، سنن الترمذي : (3747) ، والسنن الكبرى للنسائي : (7/328) ، وصحيح ابن حبان : (7002) ، شرح السنة للبغوي : (3925) ، مسند البزار : (1020) ، مسند ابي يعلى : (835) .

(100) صحيح مسلم : (119) .

## ( چاكترينى هاوەڵان )

وە شايەدى دەدەن و بڕوايان وايە كە چاكترينى هاوەڵانى پێغەمبەرى الله ( صلى الله عليـه وسـلم ) ئەبـوبەكرە ئينجـا عـومەر ئينجا عوثمــان ئينجــا عەلــى ، وە ئەوانـيش خەلـيفەى جێنشـينى ڕێمونيكراوەكـانن كە پێغەمبەر ( صلى الله عليـه وسـلم ) باسـى خيلافەتەكەيـانى كـردووە لەو فەرمـوودەيەى كە سـەعيدى كـوڕى نەبهان لە سفينەوە ڕيوايەتى كردووە : ( جێنيشينى لەدواى من سى ساڵە )[101] ، وە لەدواى كۆتـايى هـاتنى مـاوەى جێنيشـيان حـوكم گەڕايەوە بـۆ پاشـايەتى سـتەمكارى لەسـەر ئەوەى كە پێغەمـبەرى الله ( صـلى الله عليـه وسـلم ) ڕايگەياندووە لەسەر ئەو باسە .

## ( خيلافەت )

وە هـاوەڵانى حەديـث ئەوە دەسـەلمێنن كە خـيلافەت دواى وەفـاتى پێغەمبەرى الله ( صلى الله عليه وسلم ) خيلافەتەكەى ئەبوبەكرە ڕەزاى الله لەسەرى بێت ، بەهەڵبژاردنـى هـاوەڵان و كۆدەنگيـان لەسـەرى و قسـەكەيان كە بەڵگەيـەكـى بـراوەيە : ( پێغەمـبەرى الله صـلى الله عليـه وسـلم ڕازى بـوو لێـى بـۆ دينەكەمـان ئـێمەش ڕازى بـووين پێـى بـۆ دونيامـان )[102] ، واتە : ئەبـوبەكرى كـرد بە شوێنگرەوەى خۆى بۆ نوێژكردن بە بەخەڵكى لە ڕۆژانى نەخۆشبوونى ئەوەشيان دينە ، ئێمەش ڕازى بووين بە بونى ئەبوبەكر بە جێنشينى پێغەمبەر لەسەرمان لە كاروبارى دونيامان - وە ئەو قسەيەيان : پێغەمبەرى الله تۆى پێشخستووە جا كێ دوات دەخات ؟ مەبەستيان لەوەيە كە پێغەمبەرى الله تۆى پێشخستووە بۆ نوێژ

(101) مسند أحمد : (21919) ، وسنن الترمذي : (2226) ، وسنن النسائي الكبرى : (7/313) ، صحيح ابن حبان (6657) ، مسند أبي دادو الطيالسي : (2/430) ، مسند البزار (9/280) ، السنة لإبن إبي عاصم : (1181) ، جامع البيان وفضله لإبن عبدالبر : (2/1169) ، المعجم الكبير للطبراني : (1/55) ، الأعتقاد للبيهقي پەڕەى : (333) .

(102) ئەو قسەيە لە على كوڕى ئەبو طالبەوە ڕيوايەت بووە ، سەيرى الشريعة للآجري : (4/1721) بكە بە ژمارە : (1192) .

دابەستن بۆمان لەكاتی نەخۆشی پێغەمبەردا ، ئێمەش بە فەرمانی ئەو نوێژمان لەدوات كرد ، جا كێ دوات دەخات دوای ئەوەی كە پێغەمبەر تۆی پێشخست ، وە پێغەمبەری الله ( صلى الله عليه وسلم ) لەماوەی ژیانیدا باسی ئەبوبەكری دەكرد بۆ هاوەڵانی ڕوون دەكردەوە بەوەی هەقترین كەس بۆ جێنیشینی خۆی ئەبوبەكرە ، بەهۆی ئەوەوە كۆدەنگ بوون لەسەری و سودیان لەجێنشینی وەرگرت و پێی بەرزبوونەوە ، هەتاوەكو ئەبو هورەیرە ڕەزای الله لەسەری بێت فەرمووی : سوێند بەوەی كە جگە لە الله هیچ خوایەكی تر نییە ئەگەر ئەبوبەكر نەبوبا بە جێنشین الله تعالی نەدەپەرسترا ، وە پێی نەدەگوترا ، وازبێنە ئەی ئەبو هورەیرە ، هەڵسا بە بەڵگەدان بۆ دروستیەتی قسەكەی ، ئەوانیش بەڕاستیان دانا و دانیان پێنا .
دواتر خیلافەتی عومەری كوڕی خەطاب الله لێی ڕازی بێت ، بە جێنیشین دانانی لەلایەن ئەبوبەكرەوە الله لێی ڕازی بێت ، وە كۆدەنگی هاوەڵان لەسەری لەدوای ئەبو بەكر ، الله تعالی ش سەركەوتن و بەرزكرنەوەی ئیسلام و زانینی نرخی ئیسلامی بەخشی بە جێنشینی عومەر .

دواتر خیلافەتی عوثمان الله لێی ڕازی بێت بەكۆدەنگی كۆمەڵەی ڕاوێژكاران و كۆدەنگی هاوەڵان و ڕازیبونیان لەسەری تاوەكو جێنشینی پێ درا .

دواتر خیلافەتی عەلی الله لێی ڕازی بێت بەبەیعەت پێدانی هاوەڵان بۆی ، هەموو هاوەڵان الله لێان ڕازی بێت زانیان كە چاكترین و هەقترین كەس بۆ خیلافەت لەو كاتەدا عەلیە ، وە سەرپێچی كردن و پێچەوانەكردنیان بەدروست نەزانی .

ئەو چوار خەلیفە ڕێنمونی كراو و پێگەشتوانە كە الله تعالی دینی پێ سەرخستن ، وە زاڵی كردن بەسەر بێدینان ، وە ئیسلامی بەرزكرد بە جێنشینیان ، وە هەقی بەرزكردەوە لەكاتی ئەواندا ، وە تاریكایی ڕووناك كردەوە بە ڕۆشنایی ئەوان ، وە بەڵێنی پێشووی بۆ خیلافەتەكەیان وە دەست هێناوە وەك لەوتەی الله تعالی دا :

( وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنْكُمْ وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُم فِي الأَرْضِ كَمَا اسْتَخْلَفَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ الَّذِي ارْتَضَى لَهُمْ وَلَيُبَدِّلَنَّهُمْ مِنْ بَعْدِ خَوْفِهِمْ )[103] ، وه له وته‌كه‌يدا : ( وَالَّذِينَ مَعَهُ أَشِدَّاءُ عَلَى الْكُفَّارِ رُحَمَاءُ بَيْنَهُمْ )[104] تا وته‌كه‌ى : ( كَزَرْعٍ أَخْرَجَ شَطْأَهُ فَآزَرَهُ فَاسْتَغْلَظَ فَاسْتَوَى عَلَى سُوقِهِ يُعْجِبُ الزُّرَّاعَ لِيَغِيظَ بِهِمُ الْكُفَّارَ )[105] ، جا ئه‌و كه‌سه‌ى خۆشى بوێن و دۆستايه‌تيان بكات و دوعايان بۆ بكات و هه‌قى زانين و فه‌زڵ و پله‌يانى زانى ئه‌وا براوه‌يه له‌گه‌ڵ براوه‌كاندا ، وه ئه‌وه‌شى ڕقى لێيان ببێته‌وه و جنێويان پێ بدات و شتيان بداته پاڵ وه‌ك ئه‌و شتانه‌ى كه ڕافضه‌كان و خه‌واريج ده‌يده‌نه پاڵيان - نه‌فره‌تى الله له‌سه‌ريان - ئه‌وا له‌گه‌ڵ هيلاك چوان به هيلاك ده‌چێت ، پێغه‌مبه‌رى الله ( صلى الله عليه وسلم ) فه‌رموويه‌تى : ( جنێو به هاوه‌ڵانم مه‌ده‌ن ، نه‌فره‌تى الله له‌سه‌ر ئه‌و كه‌سه‌ى جنێويان پێ ده‌دات )[106] ، وه فه‌رمووده‌ى : ( ئه‌وه‌ى هاوه‌ڵانى منى خۆشى بوێ ئه‌وا به‌خۆشه‌ويستى خۆم خۆشم ده‌وێين ، ئه‌وه‌شى ڕقى لێيان ببێته‌وه ئه‌وا به ڕقى خۆم ڕقم لێيان ده‌بێته‌وه ، ئه‌وه‌شى ئازاريان بدات ئه‌وا ئازارى منى داوه ، ئه‌وه‌شى جنێويان پێ بدات ئه‌وا به‌ر نه‌فره‌تى الله بكه‌وێت )[107] .

## ( نوێژكردن له‌دواى پێشه‌واى چاك و خراپ و جيهادكردن له‌گه‌ڵى و دوعا بۆ كردنى )

وه هاوه‌ڵانى حه‌ديث جومعه و جه‌ماعه‌ت و جگه له‌وانه‌ش له نوێژه‌كان به‌دروست ده‌بينن له‌دواى هه‌موو پێشه‌وايه‌كى موسڵمان ، چاك بێت يان خراپ ،

(103) سورة النور : 55 .
(104) سورة الفتح : 29 .
(105) سورة الفتح : 29 .
(106) فضائل الصحابة لإمام أحمد : (1/54) به‌ژماره : (11) .
(107) زه‌عيفه : مسند أحمد : (16803) ، سنن الترمذي : (3862) ، صحيح ابن حبان : (7286) ، مسند أبي يعلى : (4175) ، شعب الإيمان : (3/93) ، شرح السنة للبغوي : (14/70) .

وه جیهـادکردنی کـافران لەگەڵیـان بە دروسـت دەزانـن ئـەگەر سـتەمکار و خراپەکـاریش بـن ، وە دوعـاکردنی چاکبوونیـان و ڕێنمـونی بۆیـان بەدروسـت دەزانـن ، وە دەرچـوون لێیـان بەدروسـت نـازانن ئـەگەر لادان لە دادپەروەری و ستەمیشان لێ بەدی بکرێت ، وە کوشتاری کۆمەڵەی زێدەڕەو بەدروست دەزانن تاوەك دەگەڕێنەوە بۆ گوێڕایەلی پێشەوای دادپەروەر .

## ( هەڵوێستی ئەهلی سوننەت و جەماعەت لەسەر ئەو کێشانەی لەنێوان هاوەڵاندا ڕوویان داوە )

وە هاوەڵانی حەدیث بیروبڕوایان وایە کە دەبێت دەست هەلبگیرێت لەو کێشە و ڕووداوانەی کە لەنێـوان هـاوەڵانی پێغەمبەرەوە ( صـلی الله علیـه وسـلم ) ڕووی داوە ، وە پاك کردنەوەی زمان لە باسکردنیان بەوەی کە ببێتە هۆی کەموکورتی بۆیان ، وە بڕوایان بە بەزەیی ناردن بەسەر هەموویان هەیە وە دۆستایەتیکردن و خۆشویسـتنی تێکڕایـان ، وە بەهەمـان شـێوە بڕوایـان بە بەرزڕاگرتنـی نرخـی هاوسـەرانی هەیە ( الله لێیـان ڕازی بێـت ) و دوعـا بـۆ کردنیـان و زانینـی پلەیـان و دانپێدانانی ئەوەی کە دایکانی ئیماندارانن .

## ( چوونە بەهەشت بە فەزڵی الله و بەزەییەکەیەتی نەك شتی تر )

وە بڕوایان وایە وشایەدی دەدەن کە هیچ کەسێك بەهەشت بۆی پێویست نابێت ئـەگەر کردەوەکانیشـی چاك بێـت و ئـەگەر پەرسـتنەکانی ئەوپەڕی پەرسـتنی الله تعـالی بێـت و ئـەگەر گوێڕایەلیەکی باشترین گوێڕایەلی بێـت ، وە ڕێگاکەی ڕوون نییە مەگەر الله تعالی فەزڵی دابێتە سەری ، ئینجا بەهەشتی بۆ پێویست بکات بە منـەت و فەزڵـی خـۆی ، ئـەگەر کردەوەیەکـی چاك بکات بـۆی ئاسـان نابێـت و نەدەبـوو تەنیـا بە ئاسـانکردنی لەلایەن الله تعـالی ـەوە ، ئـەگەر الله بـۆی ئاسـان نەکردبوایە ئەوا لەسـەری ئاسـان نەدەبوو ، وە ئـەگەر الله ڕێنمونی نەکردبوایە بۆ ئەو کارە ئەوا هەرگیز ڕێنمونی نەدەکرا بۆی ، الله تعالی فەرموویەتی : ( وَلَوْلَا فَضْلُ

اللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُ مَا زَكَىٰ مِنكُم مِّنْ أَحَدٍ أَبَدًا وَلَٰكِنَّ اللَّهَ يُزَكِّي مَن يَشَاءُ )[108] وه دەربارەی بەهەشتیەکان فەرموویەتی : ( وَقَالُوا الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي هَدَانَا لِهَذَا وَمَا كُنَّا لِنَهْتَدِيَ لَوْلا أَنْ هَدَانَا اللَّهُ )[109] وه ئایەتی تر هاوشێوەی ئەو ئایەتانە .

## ( هەموو دروستکراوێك ئەجەلێکی هەیە )

وه بڕوایان وایە و شایەدی دەدەن کەوا الله تعالی بۆ هەموو دروستکراوێك ئەجەلێکی داناوه ، وه هیچ نەفسێك نامرێت تەنیا بە ویستی الله تعالی و نوسراوه و ماوەکەی دیاریکراوه ، وه ئەگەر ئەجەل و کۆتایی مرۆڤ هات ئەوا هەردەبێت بمرێت و هیچ ڕزگاربوونێکی لێ نییە ، الله تعالی فەرموویەتی : ( وَلِكُلِّ أُمَّةٍ أَجَلٌ ۖ فَإِذَا جَاءَ أَجَلُهُمْ لَا يَسْتَأْخِرُونَ سَاعَةً ۖ وَلَا يَسْتَقْدِمُونَ )[110] وه فەرموویەتی : ( وَمَا كَانَ لِنَفْسٍ أَن تَمُوتَ إِلَّا بِإِذْنِ اللَّهِ كِتَابًا مُّؤَجَّلًا )[111] .

وه شایەدی دەدەن کە ئەو کەسەی بمرێت یاخود بکوژرێت ئەوا ئەجەڵ و ماوەی ژیانی لەدونیا کۆتایی هاتووه ، الله تعالی فەرموویەتی : ( قُل لَّوْ كُنتُمْ فِي بُيُوتِكُمْ لَبَرَزَ الَّذِينَ كُتِبَ عَلَيْهِمُ الْقَتْلُ إِلَىٰ مَضَاجِعِهِمْ )[112] وه فەرموویەتی : (أَيْنَمَا تَكُونُوا يُدْرِككُّمُ الْمَوْتُ وَلَوْ كُنتُمْ فِي بُرُوجٍ مُّشَيَّدَةٍ )[113] .

## ( وەسوەسەی شەیتان )

وه دڵیان جێگیرە بەوەی الله تعالی شەیتانەکانی دروستکردووه و وەسوەسە بۆ ئادەمیەکان دروست دەکەن و وەدەیان خەنە نێو هەڵەوه و پلانیان بۆ دادەڕێژن ، الله تعالی فەرموویەتی : ( وَلَا تَأْكُلُوا مِمَّا لَمْ يُذْكَرِ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ وَإِنَّهُ

---

(108) سورة النور : 21 .
(109) سورة الأعراف : 43 .
(110) سورة الأعراف : 34 .
(111) سورة آل عمران : 145 .
(112) سورة آل عمران : 154 .
(113) سورة النساء : 78 .

لَفِسْقٌ ۗ وَإِنَّ الشَّيَاطِينَ لَيُوحُونَ إِلَىٰ أَوْلِيَائِهِمْ لِيُجَادِلُوكُمْ ۖ وَإِنْ أَطَعْتُمُوهُمْ إِنَّكُمْ لَمُشْرِكُونَ )[114] ، وە الله تعالى ویستی لەهەرکەسێك بێت دەیخاتە داویانەوە و ئەو کەسەش دەپارێزێت لە فێڵیان کەوا ویستی لەسەرە ، الله تعالى فەرموویەتی : ( وَاسْتَفْزِزْ مَنِ اسْتَطَعْتَ مِنْهُم بِصَوْتِكَ وَأَجْلِبْ عَلَيْهِم بِخَيْلِكَ وَرَجِلِكَ وَشَارِكْهُمْ فِي الْأَمْوَالِ وَالْأَوْلَادِ وَعِدْهُمْ ۚ وَمَا يَعِدُهُمُ الشَّيْطَانُ إِلَّا غُرُورًا * إِنَّ عِبَادِي لَيْسَ لَكَ عَلَيْهِمْ سُلْطَانٌ ۚ وَكَفَىٰ بِرَبِّكَ وَكِيلًا )[115] ، وە فەرموویەتی : ( إِنَّهُ لَيْسَ لَهُ سُلْطَانٌ عَلَى الَّذِينَ آمَنُوا وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ * إِنَّمَا سُلْطَانُهُ عَلَى الَّذِينَ يَتَوَلَّوْنَهُ وَالَّذِينَ هُم بِهِ مُشْرِكُونَ )[116] .

## ( جادوو و جادووگەران )

وە شایەدی ئەوە دەدەن کە جادوو و جادووگەر لەدونیادا هەن ، بەوەی کە زیان بەهیچ کەسێك ناگەیێنن تەنیا بە ویستی الله تعالى نەبێت ، الله تعالى فەرموویەتی : ( وَمَا هُم بِضَارِّينَ بِهِ مِنْ أَحَدٍ إِلَّا بِإِذْنِ اللَّهِ )[117] ، ئەو کەسەشی کە جادوو بکات و جادوو بەکاربهێنێت و بڕوای وابێت کە سود و زیانی هەیە بەبێ ویستی الله تعالى ئەوا کافر بووە ، وە ئەگەر وەسفی کوفری بەسەردا چەسپا ئەوا داوای تەوبەی لێدەکرێت ، جا ئەگەر تەوبەی کرد ئەگەرنا لە گەردنی دەدرێت ، وە ئەگەر بە جگە لە کوفر وەسفی بکرێت یاخود قسەیەك بکات کە تێی ناگات ئەوا ڕێگری لێدەکرێت ، ئەگەر گەڕایەوە سەری ئەوکات سزا دەدرێت ، وە ئەگەر گوتی : جادوو حەرام نییە و بڕوام بەوە هەیە کە دروستە و ڕێگاپێدراوە ئەوکات کوشتنی واجبە ، چونکە شتێکی حەڵاڵ کردووە کە موسڵمانان کۆدەنگن لەسەر حەرامیەتی .

(114) سورة الأنعام :121 .
(115) سورة الإسراء : 64 _ 65 .
(116) سورة النحل : 99 _ 100 .
(117) سورة البقرة : 102 .

## ( نیشانەی هاوەڵانی حەدیث )

وە هاوەڵانی حەدیث ئەو خواردنەوەی بێهۆشکەرانە بەحەرام دەزانن کە لە ترێ و مێوژ و خورما و هەنگوین و شەندەری و هاوشێوەی ئەوانە وەرگیراوە کە دەبێتە هـۆی بێهۆشـی ، کەم و زیـادی حەرام دەکەن و لێـی دووردەکەونەوە و بە پیسـی دادەنـێن وە سـزادان و جێبەجێکردنـی حەد بە واجـب دادەنـێن بەسـەر ئەو کەسانەی دەیان خۆنەوە .

وە وایدەبینن کە پێویستە هەوڵو تێکوشـان بـدرێت بـۆ ئەنجام دانـی نوێژەکـان و ئەنجامدانیان لە سەرەتای کاتەکانیان چاکترە لە دواخستنی بۆ کاتەکانی کۆتایی نـوێژ بـۆ بەدەسـتهێنانی پاداشـتی چـاك وجـوان بەکردنیـان لەکـاتی خۆیانـدا ، وە خوێنـدنی فـاتیحە لەدوای ئیمـام بە واجـب دەزانـن ، وە فەرمـان دەکەن بە تەواو کردنــی ڕکــوع و ســوجدەکان کەوا بێگومــان واجــبە ، وە بەتەواوی ڕکــوع و سـوجدەبردن و ئارامـی دڵ تێیانـدا وە بەرزبـوونەوە لە ڕکـوع و پێـدانی مـاوەیەکی وەستان بۆی و ئارامبون و مانەوە تێیدا ، بەهەمان شێوە بەرزبوونەوە لەسوجدە و دانیشتن لەنێوان دوو سوجدەکەدا بە ئارامی و مانەوە تێیدا ئەمانە هەمووی لە ڕووکنەکانی نوێژن کە نوێژ دروست نابێت بەبێ ئەوانە .

وە وەسیەت دەکەن بەئەنجامدانی شەو و نوێژ لەدوای کاتی خەوتنان ، وە بەجێ گەیانـدنی سـیلەی ڕەحـم و بڵاوکـردنەوەی سـەلام و بەخشـینی خـواردن وە بە بەزەییبوون بەرامبەر فەقیر و هەژار و کەم دەرامەت و یەتیمەکان ، وە گرنگیدان بەکارووبــاری موســڵمانان ، وە لــوت بەرزنەبــوون بەرامــبەر بە خــواردن و خواردنەوەکان و هاوسەرگیری و جلو بەرگەکان ، وە هەوڵدان و پێشبڕکێ کردن بۆ ئەنجامدانی کردەوەی چاکە و فەرمانکردن بە چاکە و ڕێگری کردن لەخراپە ، وە ترسان لە سەرئەنجامی خراپەی تەماع وە وەسیەت دەکەن بەهەق و ئارامی .

وە خۆشەویستی و ڕقلێبوونەوەیان لە پێناو دینە ، وە لە پێناو الله پارێزی دەکەن لە گفتوگـــۆ و دەمەدەمکـــێ ، وە دوور دەکەونەوە لە کـــۆمەڵەی بیـــدعەچی و گومڕایان ، وە دژایەتی کۆمەڵانی هەوا و ئارەزوو نەزانان دەکەن .

## ( ئیقتیداکردن بەپێغەمبەر و هاوەڵان و پێشینانی چاك )

وە ئیقتیـدا دەکەن بە پێغەمـبەر و هـاوەڵانی کە وەك ئەسـتێرەیەکی درەوشـاوەن لاسایی پێغەمبەرەکەیان کردەوە و ڕێنمونیکران ، وەك چۆن پێغەمبەر ( صلى الله عليـه وسـلم ) دەربارەیـان فەرمـوویەتی ، وە ئیقتیـدا دەکەن بەپێشـینانی چـاك لە گەورە زانایانی موسڵمانان ، وە دەست دەگرن بەوەی ئەوان دەستیان پێوەگرتبوو لە دینێکی بەهێز و هەقێکی ڕوون و ئاشکرا .

## ( ڕقلێبوونەوەی کۆمەڵەی بیدعەچیان و دوورکەوتنەوە لێیان )

وە ڕقیان لە بیدعەچیان دەبێتەوە کە شتێکیان داهێناوە لەدین کە لەدیندا نییە ، وە خۆشـــیان نـــاوێن و هاوڕێیەتیـــان نـــاکەن و گـــوێ لەقســـەکانیان ناگـــرن وە لەگەڵیـــان دانانیشـــن و گفتوگـــۆ و منازەرەیـــان لەگەڵ نـــاکەن ، وە وایـــدەبینن کە پێویستە گوێچکەکانیان بگرن لە کاتی باسکردنی قسە پوچەکانیان کە ئەگەر بە گوێیەکانـدا بچێـت گومـان و پەشـێوی وەسوەسـەو شـتی ترسـناك و بـێ کەڵـك دەکەوێـتە نـاو دڵەوە ، هەر الله تعـالى دەربـارەی ئەوە ئایەتـی دابەزانـدووە و فەرموویەتی : ( وَإِذَا رَأَيْتَ الَّذِينَ يَخُوضُونَ فِي آيَاتِنَا فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ حَتَّىٰ يَخُوضُوا فِي حَدِيثٍ غَيْرِهِ )[118] .

## ( نیشانەکانی کۆمەڵەی بیدعەچیان )

وە نیشـانەکانی بیـدعەچیان بەسـەر خۆیـانەوە ڕوونەو ئاشـکرایە ، وە ڕوونتـرین نیشـانەیان بـریتییە لەتونـدیەتی دژایەتـی کردنیـان بـۆ وەرگرتنـی فەرموودەکـانی

(118) سورة الأنعام : 68 .

پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) ، وە دژایەتیکردن و بەخراپ باسکردنیان و ناونانی شوێنکەوتوانی بەنەزان و ڕووکەشی و وێکچوویی ( مشبهه )، بە بیروباوەڕی خۆیان کە فەرموودەکانی پێغەمبەر دوورە لە زانست ، بەلام زانستەکەیان بریتیە لەو زانستەی کە شەیتان دەیخاتە ناو دڵیانەوە لە سەرئەنجامی ئەقڵی بێ کەڵکیان وە وەسوەسەی تاریکی دڵیان وە خەیاڵاتی پەکخراوی دڵ و دەروونیان لە چاکە ، بەڵکو گومانەکانیان پوچ و بەتاڵە ، الله تعالى فەرموویەتی : ( أُولَٰئِكَ الَّذِينَ لَعَنَهُمُ اللَّهُ فَأَصَمَّهُمْ وَأَعْمَىٰ أَبْصَارَهُمْ )[119] ، وە فەرموویەتی : ( وَمَن يُهِنِ اللَّهُ فَمَا لَهُ مِن مُّكْرِمٍ ۚ إِنَّ اللَّهَ يَفْعَلُ مَا يَشَاءُ )[120] .

## ( بیدعەچیان ئاثار ڕەتدەکەنەوە )

گوێم لە حاکم ئەبو عبدالله بوو دەیفەرموو : گوێم لە ئەبو علی حەسەن کوڕی علی بوو دەیفەرموو : گوێم جەعفەری کوڕی أحمد سنان واسطی بوو دەیفەرموو : گوێم لە أحمدی کوڕی سنان قطان بوو دەیفەرموو : ( هیچ بیدعەچیێك نییە لەدونیادا ئیلا ڕقی لە هاوەڵانی سونەتە ، کاتێك کە پیاو داهێنراوێك دادەهێنێت تام و چێژی سونەت لەدڵیدا نامێنێت ) .

( وە گوێم لە حاکم بوو دەیفەرموو : گوێم لە ئەبو حسێن محمد کوڕی أحمد حنظلی لەبەغداد بوو دەیفەرموو : گوێم لە محمدی کوڕی ئیسماعیل ترمذی بوو دەیفەرموو : من و أحمدی کوڕی حەسەن ترمذی لای پێشەوا أحمدی کوڕی حەنبەڵ بووین ، أحمدی کوڕی حەسەن پێی گووت : ئەی باوکی عبدالله ، لە مەککە باسی شوێنکەوتوانی سونەتیان کرد بۆ ئەبو قەتیلە ، گوتی : هاوەڵانی حەدیث کۆمەڵەیەکی خراپن ، أحمدی کوڕی حەنبەل هەڵسا و جلەکانی دادەکوتی و دەیفەرموو : زەندیق ، زەندیق ، زەندیق ، تاوەکو چووە ماڵەوە )[121] .

(119) سورة محمد : 23 .

(120) سورة الحج : 18 .

(121) معرفة علوم الحديث لحاكم پەڕەی : (4)، شرف أصحاب الحديث لخطيب پەڕەی (74) .

( وە گوێم لەحاكم باوكی عبداللە بوو دەیفەرموو : گوێم كە ئەبو نەصر أحمد كوڕی سوهەیل بوو دەیفەرموو : گوێم لە ئەبو نەصر كوڕی سەلام بوو دەیفەرموو : هیچ شتێك بەڕادەی گوێبیست بوونی فەرمووده و ڕیوایەت و سەنەدەكانی گران نییە لەسەر بێدینان وە ڕقیان لە هیچ شتێك نابێتەوە بەڕادەی ئەوە ) [122] .

( وە گوێم لە حاكم بوو دەیفەرموو : گوێم لە شێخ ئەبو بەكر أحمەدی كوڕی ئیسحاق كوڕی ئەیوب بوو گفتوگۆی لەگەڵ پیاوێك دەكرد جا شێخ ئەبو بەكر فەرمووی : فلان بۆی باسكردین ، پیاوەكە بە شێخی فەرموو : واز بێنە لە بۆی باسكردین بۆی باسكردین تاكەی بۆی باسكردین ؟ ، شێخ پێی فەرموو : هەستە ئەی كافر ، واللە هەرگیز بۆت نییە دوای ئەوە بێیتە ماڵەكەمەوە ، دوای ئەوە ڕووی وەرگێڕا بۆ لامان وفەرمووی : واللە بەكەسم نەگووتوە نەیەیتە ماڵەكەوەمە جگە لەو كەسە نەبێت )[123] .

## ( ناو و ناتۆرەلێنانی بیدعەچیان بۆ ئەهلی هەق )

( گوێم لە ئەبو مەنصور محمەدی كوڕی عبداللە كوڕی حمشاد بوو دەیفەرموو : گوێم لە ئەبو قاسم جەعفەر كوڕی أحمد مقری ڕازی بوو دەیفەرموو : بۆ عبدالرحمنی كوڕی ئەبو حاتمی ڕازی خوێندرایەوە ومنیش گوێم لێ بوو : گوێم لە باوكم بوو دەیفەرموو - مەبەستی پێ لە ئیمامی شارەكەی خۆی بوو باوكی ئەبو حاتم محمەدی كوڕی ئیدریس حنظلی ڕازی بوو دەیفەرموو - : نیشانەی بیدعەچیان بریتییە لە تانەدان لە ئەهلی ئەثەر ، وە نیشانەی زەندیقەكان بریتیە لە ناونانیان بۆ ئەهلی ئەثەر بە بێ كەڵك ، مەبەستیان لەوەش بەتاڵكردنەوە و نەهێشتنی ئەثەرە ، وە نیشانەی قەدریەكان ئەوەیە كە ناوی ئەهلی سونە دەنێن بە جەبری ، وە نیشانەی جەهمیەكان بریتییە لە ناونانی ئەهلی سوننە بە

(122) معرفة علوم الحديث لحاكم پەڕەی : (4)، شرف أصحاب الحديث لخطيب پەڕەی : (73) .

(123) معرفة علوم الحديث لحاكم پەڕەی : (4) .

لێکچووەکان ( مشبهە ) وە نیشانەی ڕافضەکان بریتییە لەناونانی ئەهلی سوننە بە دوور لەدین و دوژمنی علی کوڕی ئەبو طالب )[124] .

ئەوەش گوتم : ئەوەش هەموو لە توڕەیی و چاو هەڵنەهاتنیانە پێیان ، هیچ ناوێك نییە بلکێت بە ئەهلی سوننە جگە لە یەك ناو نەبێت ئەویش هاوەڵانی حەدیثە ، بینیم لەو ناو و نازناوانەی کە بیدعەچیان دەیدەنە پاڵ ئەهلی سوننە ڕێگا و ڕێبازی موشریکانیان گرتۆتەبەر لەگەڵ پێغەمبەردا ( صلى الله عليه وسلم ) ، ئەوان قسەی زۆریان دابەشکرد لەسەری ، هەندێکیان ناویان برد بە جادووگەر ، وە هەندێکیان بە کاهین ، هەندێکیان بەشاعیر ، هەندێکیان بە شێت ، هەندێکیان بەفیتنەچی ، هەندێکیان بە درۆزن و درۆ هەڵبەستن ، بەڵام پێغەمبەری الله دووربووە و بەریبووە لەو کەموکورتیانە ، تەنیا پێغەمبەرێکی هەڵبژێردراو بوو ، الله تعالى فەرموویەتی : ( انظُرْ كَيْفَ ضَرَبُوا لَكَ الْأَمْثَالَ فَضَلُّوا فَلَا يَسْتَطِيعُونَ سَبِيلًا )[125] ، بەهەمان شێوە بیدعەچیان الله سەرشۆڕیان بکات قسەی زۆریان لەسەر هەڵگرانی فەرموودەکانی و گوێزەرەوانی ئاثارەکانی و گێڕەوانی فەرموودەکانی لە ئیقتیداپێکراوان و ڕێنمونی کراوان بەسوننەتەکەی کرد ، جا هەندێکیان ناویانیان برد بەبێ کەڵك و بێ سوود ، وەهەندێکیان بە دوور لە دین ، هەندێکیان بە دوژمنی علی کوڕی ئەبو طالب ، هەندێکیان بە جەبری ، بەڵام هاوەڵانی سونەت کۆمەڵەیەکی دوورن و بەریئن و پاکن لەو کەمو کورتیانە ، وە جگە لە ئەهلی سونەتی پێشوو و ڕۆشتوان لەسەر ڕێگای پێشین و ڕێگای میانڕەوی هیچی تر نین وە خاوەنی بەڵگەی بەهێزن ، الله تعالى ڕێنیشاندەری کردن بۆ شوێنکەوتنی پەرتووکەکەی و نیگا و ووتەکانی ، وە ئیقتیداکردن بە پێغەمبەرەکەی ( صلى الله عليه وسلم ) لە فەرموودەکانی کە فەرمانی کردووە بە ئومەتەکەی بە فەرمان کردن بە چاکە بە گوفتار و کردار ، وە ڕێگری کردنیان لە

(124) شرح أصول أعتقاد أهل السنة والجماعة للالكائي : (1/197) بەژمارە : (321) ، العلو للذهبي پەڕەی : (190) .
(125) سورة الفرقان : 9 .

خـراپە ، وە یارمەتیـدان بـۆ دەسـتگرتن بە ژیاننـامەکەی و ڕێنمـونی کـردن بـۆ پێویستیەتی سوننەتەکانی ، وە دڵ کردنەوە بەخۆشەویستی خۆی و خۆشەویستی گەورەیـانی شـەریعەتەکەی و زانایـانی ئوممەتەکـەی ، ئەوەشـی هەر کۆمەڵەیەکی خۆشبوویێت لەقیامەتدا لەگەڵ ئەوانە بەبڕیاری وتەی پێغەمبەری الله ( صلى الله عليه وسلم ) : ( مرۆڤ لەگەڵ ئەوکەسە دایە کە خۆشی دەوێت ) [(126)] .

## ( نیشانەکانی ئەهلی سوننە )

وە یەکێك لە نیشانەکانی ئەهلی سوننە بریتیە لە خۆشەویستیان بۆ گەورەیان و زانایـان و سـەرخەران و دۆسـتانی سـونەت ، وە ڕق و کینەیـان بەرامـبەر بە بیدعەچیان ، ئەوانەی کە بانگەوازی بۆ ئاگر دەکەن وە ڕێگای تیاچوون نیشانی هاوەڵانیـان دەدەن ، وە الله تعـالی دڵـی ئەهلـی سـونەی پـاك ڕاگـرت و ڕوونـاکی کردەوە بە خۆشەویستی زانایانی سوننە بەفەزڵ و منەتی خۆی .

## ( خۆشویستنی ئەهلی هەق و باسکردنی ناوی هەندێکیان )

( حـاکم ئەبو عبـدالله الله هەواڵی پێدایـن الله ئەو و ئێمەش بخاتە بەهەشتەوە : محمدی کوڕی ئیبراهیم کوڕی فضـل مەزەکی بۆی باس کردین : أحمـدی کوڕی سـەلەمە بـۆی باسـکردین : ئەبـو ڕەجـاء قتیـبە کـوڕی سـعید کتێبـی ئیمـانی بـۆ خوێنـدینەوە کۆتاییەکـەی بریتیـی بـوو لـە : جـا ئـەگەر پیاوێکـت بینـی سـوفیانی ثەوری و مـالیکی کـوڕی ئەنەس و ئەوزاعـی و شـوعبە و ئیبنـو موبـارەك و ئەبـو ئەحـوەص و شـەریك و وەکیـع و یحیـی ــی کـوڕی سـەعید و عبـدالرحمنی کـوڕی مەهدی خۆشـدەوێت ، بزانە ئەو کەسە لەسەر سونەتە ، أحمدی کوڕی سـەلەمە ڕەحمەتی الله لەسەری بێت فەرمووی : منیش بە دەسخەتی خۆم بەدوای ئەوەدا نوسـیم : وە یحیـی کـوڕی یحیـی و أحمـدی کـوڕی حەنـبەل و ئیسـحاقی کـوڕی ڕاهویە ، جـا کە لەو نوسینە تەواوبووین خەڵکی نیسـابوور سـەیریان کردین ، وە

(126) صحيح البخاري : (3688) ، صحيح مسلم : (2639) .

فەرمووی : ئەو قەومە ڕقیان لە یحیی کوڕی یحیی یە ، ئێمەش پێمان گوت : ئەی باوکی ڕەجاء یحیی کوڕی یحیی کێیە ؟ فەرمووی : پیاوێکی چاکی ئیمامی موسڵمانانە ، وە ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیم ئیمامە ، وە أحمدی کوڕی حەنبەل لەهەموو ئەو کەسانە گەورەترە کە ناوم هێنان .

وە منیش بەدوای ئەوانەی کە قتیبە ڕەحمەتی اللە لەسەری بێت باسیکردن بەوەی ئەو کەسەی خۆشیانی بوێت ئەوا لەسەر سونەتە لە پێشەوایانی فەرموودە ئەوانەی کە ئیقتیدایان پێ دەکرێت و بەڕێنمونیان ڕێنمونی دەکرێت وە خۆیان بە کۆمەڵەی ئەوان هەژماردەکەن ) [127] ، وە بە شوێنکەوتنی ئاثارەکانیان ، کۆمەڵەیەکەی تر هەن کە خۆیان لەکۆمەڵەی ئەوان هەژمار دەکەن ، لەوانە : محمدی کوڕی ئیدریس شافعی موطەلیبی ئیمامی پێشەوا و گەورە زانا ، خاوەن منەتی بەرز بەسەر ئوممەتی ئیسلام و سونەت ، ڕێنمونی کراو و شارەزا و پێکێنەر ، کە بۆ سەرخستنی دینی اللە و سونەتی پێغەمبەرەکەی کاری کرد و تێکۆشانێك کە هیچ یەکێك لە زانایانی سەردەمی خۆی و لەدوای خۆیان وای نەکردووە ، وە ئەوانەشی کە لەپێش شافعی بوون وەك : سەعیدی کوڕی جوبەیر و زوهری وشوعەیبی و تەیمی و ئەوانەشی لەدوایان هاتن وەك : لەیثی کوڕی سەعد و ئەوزاعی و ثەوری و سوفیانی کوڕی عویینە هلالی و حەمادی کوڕی سەلەمە و حەمادی کوڕی زید و یونسی کوڕی عوبەید و ئەیوب و ئیبنو عەون و هاوشێوەیان ، وە ئەوانەشی لەدوایان وەك : یەزیدی کوڕی هاروون وعبدالرزاق و جەریری کوڕی عبدالحمید ، وە ئەوانەشی لەدوایان وەك : محمدی کوڕی یحیی ذوهەلی و محمدی کوڕی ئیسماعیل و بوخاری و موسلیمی کوڕی حەجاج قوشەیری و ئەبو داود سەجستانی و ئەبو زەرعەی ڕازی بو ئەبو حاتم و کوڕەکەی و

---

(127) شعار أصحاب الحديث لحاكم پەڕەی : (30) به ژماره : (17) ، شرح أصول أعتقاد أهل السنة والجماعة : (1/74) بەژمارە : (59) ، شرف أصحاب الحديث لخطيب پەڕەی : (71) .

محمدی کوڕی موسلیم کوڕی واره و محمدی کوڕی ئەسلەم طەواسی و عوثمانی کوڕی سەعید دارمی ، وە محمدی کوڕی ئیسحاق ئیبنو خوزەیمە کە بە پێشەوای زانایان بانگ دەکرا ، وە پێشەواو زانای سەردەم وکاتی خۆی بوو ، وە ئەبو یەعقوب ئیسحاق کوڕی ئیسماعیل بەستی و جودەی- لەپێش باوکم - ئەبو سەعید یحیی کوڕی مەنصور زاهید هەرەوی ، وە عودەی کوڕی حمدویەی صابونی و دوو کوڕەکەی شمشێری سونەت ئەبو عبدالله صابونی و ئەبو عبدالرحمن صابونی ، وە هاوشێوەکانیان لە پێشەوایانی سونەت ئەوانەی کە دەستیان پێوە گرتبوو سەریان دەخست و بانگەوازیان بۆ دەکرد و دۆستایەتیان لەپێناو دەکرد .

ئەو بڕگەیەشی کە لەو بەشەدا سەلماندم بیروباوەڕی هەموویان بوو ، پێچەوانەی یەکتریان نەکردووە لەسەری ، بەڵکو کۆدەنگ بوون لەسەر هەمووی ، وە کۆدەنگبوون لەسەر ڕقلێبوونەوەیان لەبیدعەچیان و زەلیل کردنیان و ڕووڕەشکردنیان و دوورخستنەوەیان ، وە دوورکەوتنەوە لێیان و لەو کەسەش کە دۆستایەتیان دەکات ، وە نزیکبوونەوە لە الله تعالی بەدوورکەوتنەوە لێیان وهەجرکردنیان .

## ( ئامۆژگاری ئەبو عوثمان صابونی )

ئیمام ڕەحمەتی الله لەسەری فەرموویەتی : منیش بە فەزڵی الله تعالی شوێنکەوتەی ئاثارەکانیانم و ڕووناکم بە ڕووناکیەکەیان ، ئامۆژگاری برایان و هاوەڵانم دەکەم بەوەی لە ڕووناکیەکەیان لا نەدەن ، وە شوێن جگە لە قسەکانیان نەکەون ، وە خۆیان سەرقاڵ نەکەن بەو داهێنراوانەی کە سەریان هەڵداوە و بڵاوبووەتەوە لەنێوان موسڵمانان ، ئەگەر شتێك لەو داهێنراوانە بەسەر زمانی کەسێکدا بهاتبوایە لەسەردەمی ئەواندا ئەوا بەبیدعەچیان دادەنا و هەجریان دەکرد و لێی دووردەکەوتنەوە ، وە بەدرۆزنیان دادەنا و هەموو قسەیەکی خراپیان پێ دەگووت ، وە با زۆری بیدعەچیان فراوانوبوونیان

برایــانم هەڵنەخەلەتێنێــت الله بیــان پارێزێــت ، چــونکە فــراوانی و زۆری بیدعەچیــان و کەمبــوونەوەی ژمــارەی ئەهلــی هەق یەکــێکە لە نیشــانەکانی نزیکبوونەوەی قیامەت ، چونکە یەکێکە لەو نیشانانەی کۆتایی پێهاتنی دونیا کەوا پێغەمــبەری الله ( صــلی الله علیــە وســلم ) فەرمــوویەتی : ( یەکێــك لە نیشانەکانی ڕۆژی دوایی و نزیکبوونەوەی ئەوەیە کە زانست کەم دەبێت و نەزانی زیـاد دەکـات )[128] ، وە زانسـتیش بـریتیە لە سـوننەت ، وە نەزانـیش بـریتیە لە بیــدعە ، پێغەمــبەری الله ( صــلی الله علیــە وســلم ) فەرمــوویەتی : ( ئیمــان دەگەڕێتەوە بۆ مەدینە وەك چۆن مار دەگەڕێتــەوە بۆ کولێنەی خۆی )[129] ، وە فــەرموویــەتــی : ( قیـامەت هەڵناسـتێت تـاوەك لەسـەر زەوی کەسـێك بمێنێـت بلێــت : الله الله )[130] ، وە ئەو کەسەشــی ئەمــڕۆ دەســتبگرێت بەســوننەتی پێغەمــبەری الله ( صـلی الله علیـە وسـلم ) و کـاری پـێ بکـات و دامەزراو بێـت لەسـەری و بـانگەوازی بـۆ بکـات پاداشـتەکەی فراوانتر وزیـاد تـرە لە پاداشـتی ئەو کەسانەی کە لەسەرەتای ئیسلامەوە لەسەر ئەمە ڕۆشتوون کەوا پێغەمبەری الله ( صلی الله علیە وسلم ) فەرمووی : ( پاداشتی پەنجاجار ، گوترا : پەنجا لەوان ؟ ، فەرمــووی : بەلکــو لە ئێــوە )[131] ، پێغەمــبەری الله ( صــلی الله علیــە وســلم ) مەبەسـت لەو کەسـانەیە کە دەسـت دەگـرن بە سـونەتەکەیەوە لەکـاتی پەرتەوازە بوونی ئومەتەکەی .

لە کتێبی شێخی ئیمام جودەی ئەبو عبدالله محمد کوڕی عودەی کوڕی حمدویەهـ صـابونی ڕەحمەتـی الله لەسـەری بینـیم : ئەبـو عەبـاس حەسـەن کـوڕی سـوفیان نسـوی هەواڵـی پێـداین کە عەباسـی کـوڕی صـبیح بـۆی باسـکردوون : عبـدالجبار

(128) صحيح البخاري : (81) به لەفزێکیکی جیاواز لەوە .

(129) صحيح البخاري (1876) ، صحيح مسلم : (147) .

(130) صحيح مسلم : (148) .

(131) سنن أبي داود (4341) ، سنن الترمذي (3058) ، صحيح ابـن حبـان (385) ، مسند البزار : (1776) ، البدع لابن وضاح : (189) ، المعجم الكبير للطبراني : (10/182) ، شعب الإيمان للبيهقي : (12/201) .

كوڕی مەظاهر بۆی باسكردین : مەعمەری كوڕی ڕاشد بۆی باسكردم : گوێم لە ئیبنو شەهاب زوهری بوو دەیفەرموو : ( فێربوونی سونەت چاكترە لە عیبادەتی سەد ساڵ )[132] .

ئەبوبەكر محمدی كوڕی عبدالله كوڕی محمد زەكەریا شەیبانی پێی ڕاگەیاندین : ئەبو عەباس محمد كوڕی عبدالرحمن دەغوەلی پێی ڕاگەیاندین : گوێم لە محمد كوڕی حاتم مظفری بوو دەیفەرموو : گوێم لە عەمری كوڕی محمد بوو دەیفەرموو : ئەبو موعاویە ضریر قسەی لەگەڵ هارون ڕەشید دەكرد باسی فەرموودەكەی ئەبو هورەیرەی بۆ كرد : ( ئادەم و موسی كەوتنە گفتوگۆ )[133] ، عیسی ی كوڕی جەعفەر گوتی : ئەوە چۆن دەبێت لەكاتێكدا لەنێوان ئادەم و موسی ئەو هەموو ماوەیە هەیە ؟ فەرمووی هاروون ڕووبەڕووی بویەوە و پێی فەرموو : لە پێغەمبەری الله وە بۆت باسدەكات كەچی ڕەخنەی چۆنیەتی لێ دەگریت ؟ فەرمووی : بەردەوام وای دەگووتەوە تاوەك لێی بێدەنگ بوو .

ئاوا پێویستە لەسەر مرۆڤ هەواڵەكانی پێغەمبەری الله بەرز ڕابگرێت و وەریبگرێت بە قبولكردنی و تەسلیم بوون بۆی و بەڕاست دانانی ، وە زۆر بەتوندی نكۆڵی لەو كەسە بكات كە جگە لەو ڕێبازە دەگرێتەبەر وەك چۆن هاروون ڕەشید بەرەنگاری ئەو كەسە بوویەوە كە ڕەخنەی لە هەواڵی دروستی پێغەمبەری الله گرت بە چۆنیەتی و بەشێوازێكی نكۆڵیكراوی و وەرنەگرتنی ، وە بە تەواوی قبوڵی نەكرد وەك ئەوەی پێویستە هەموو ئەو شتانەی لە پێغەمبەری الله وە ( صلى الله عليه وسلم ) هاتووە وەربگیرێت .

(132) ترتيب الأمالي الخميسية للشرجاني الجرجاني : (1/88) .

(133) گفتوگۆی ئادەم وموسی بوخاری ڕیوایەتی كردووە لە صحیحەكەیدا : (6614) ، وە موسلیم لە صحیحەكەیدا : (2652) بەدووروودرێژی و تەواوی .

الله تعـالى لەو کەسـانەمان بکـات کە گـوێ لە قسـە و گوفتـار دەگـرن و شـوێن چاکترینی دەکەون ، وە بەڕادەی ژیانیان دەست دەگرن بە قورئان و سونەتەوە ، وە دوورمـــان خـــاتەوە لە هەوا و ئارەزووە گومڕاکـــان و ڕاو بۆچـــوونە لاواز و ڕووخێنەرەکان ، بە فەزڵ ومنەتی خۆی .

آخره والحمد لله وحده.

وصلى الله على سيدنا محمد وعلى آله وصحبه وسلم .

ناوەڕۆك